د . ئەورِحمانی حاجی مارف

# بەرهەمە زمانەوانییەکانم

(( نووسین و وەرگێڕان ))

بەرگی یەکەم

( کتێب و نامیلکە )

سلێمانی ـ ٢٠٠٢

# ناوەرۆکی ئەم بەرهەمە

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# چی لە بارەی زمانی کوردیەوە نوسراوە

دوکتۆر
ئەوڕەحمانی حاجی مارف

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد
بەغـدا — ۱۹۷٤

وەرامی نامەی سکرتێری گشتی کۆڕی زانیاری کورد ، ژمـــارە ١٤/٤٦١ رۆژی ٢٣/٥/١٩٧٤ دەربارەی داواکردنی نرخاندنی کتێبەکەی د. ئەورەحمـــانی حاجی مارف « چی لە بارەی زمـانی کوردییەوە نوسراوە » .

بۆ ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کوردی بەڕێز !

ئـــەم نوسینە لە رۆی ناوەرۆکەوە نرخی تایبەتی خۆی هەیە لەبەر دو هۆی گرنگ :

یەکەم ـ تائێستا لەم بابەتەوە کەس ، چ کورد چ غەیری کورد ، بەرهەمێکی رێ نیشاندەری پێشکەش بە کوردناسی و خوێنەرانی کوردی نەکردوە . یەکێك بیەوێ سەرچاوەی نوسین لە بارەی زمانی کوردییەوە بدۆزێتەوە دەبێ ماڵەو مـــاڵ و شارە و شـــار پرسیاری بۆبکا . ئەم کتێبە ، بابڵێم ئـــەم نامیلکەیە ، ڕێگەی درێژی پرسیار کردن دەپێچێتەوە و دەیکا بە یەك تاکە هەنگاو .

دوەم ـ نوسینەکە ســودبەخشترە لە بیبلیۆگرافی رووت ، چونکە دەربارەی گەلێك لەو کتێبانەی کە لەسەر زمانی کوردی نوسراون ، تا رادەی پێویست ، ڕەخنە و نرخاندنی تێدایە ، سەرەڕای ئەوە کە پوختەیێکی مێژوی نوســینەکان روون دەکاتەوە و بەمەدا

لیستەیێکی زەمەنیش ئــامادە دەکا بۆ ئەو کەسە بیەوێ بە مێژوی نوسینی کوردییەوە خەریك بێ .

بەلای باوەڕی منەوە نامیلـکەکە لێی دەوەشـێتەوە ببێتـە سەرەتاییـك کە سالە و سال لێی زیاد بکرێت و چی لە سەر زمانی کوردی لەدوا ڕۆژدا دەنوسرێت بخرێتەوە سەر خەرمانی ناو ئـەم نـوسینە .

لە دوا ئەم ڕوون کردنەوەیە هەر هێندە دەمێنێتەوە بـە کورتی بڵێم : لە چاپ دانی نامیلـکەکە کارێـکی بایـەخدارە و لەجەرگەی ئەرکەکانی کۆڕە .

چارە سەرکردنی شکلی ئەو ڕێنوسە کە پێی نوسراودتەوە و هێنانی بۆ سەر ڕێنوسی کۆڕ ، کارێـکە لە هەمو قۆناغەکانی چـاپ کردنیدا بە ئاسانی دەکرێت .

ئەندامی کارا

مەسـعود محـەمـەد

# پێشەکی

ئەو ماوەیەی لە یەکێتیی سۆڤیێت بووم ، لە کتێبخانەکانی لێنینگراد و مۆسکۆ ژمارەیەک کتێبم لە بارەی زمانی کوردییەوە بەرچاو کەوتووە و خوێندۆتەوە ، کە بەر لە چوونم بۆ ئەو وڵاتە نەک هەر نەم بینیبوون ، بەڵکو ناویشیانم نەبیستبوو ... ئێستاش لە کتێبخانەی ڕازاوەی کۆڕی زانیاری کورد لەم بارەیەوە هەندێک کتێبی نایابم دیوەتەوە کە تا ئەم ماوەیەی دوایی چاوم پێیان نەکەوتبوو[١].

بەو مەبەستەی نیشانی بدەم ، کە تاکو ئێستا لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا چی کراوە ، چونکە لە لێکۆڵینەوەی هەر کارێکی نوێدا ئاوڕدانەوە لە کاری پێشوو بایەخ و سوودی خۆی

---

(١) شایانی باسە کە کۆڕی زانیاری کورد گرنگیەکی زۆری بە کتێبخانەکەی داوە و لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششێکی بێشومار و دڵسۆزانەدا ژمارەیەکی زۆر و نایاب و بەنرخ لە نووسراوی کوردی و لە بارەی کوردەوە ... کۆ کردۆتەوە . لێرەدا دەمەوێ سەرنج بۆ ئەوە ڕابکێشم کە بەشێکی ئێجگار زۆری ئەو نووسراوانەی لەم نامیلکەیەدا لێیان دواوم لە کتێبخانەی ڕازاوەی کۆڕ هەن .

هەیە و هەروەها بۆ ئەوەی خوێنەرانی کوردی بەڕێـز ( بە تایبەتی قوتابیـــانی خوێندنی کوردی ) بزانن دەربارەی زمانەکەمان چی نوسراوە و بڵاوکراوەتەوە ، بڕیارم دا کە ئـەم نامیلـکەیـە لە بارەی ئەو نوسراوانەوە دابنێـم .

لەم رۆوەوە لە چەند ژمارەیەکی رۆژنامەی « برایەتـی » مانـگی مایس و حوزەیرانی ساڵی ۱۹۷۳دا زنجیرەیەك وتارم بڵاوکردەوە[٢] ، بەڵام پاش ئەوەی چەند دۆستێـك داوایان لێ‌کردم ئـــەو وتارانەم کۆبکەمەوە و پاش ئەوەش کە هەندێ سەرچاوەی ترم دۆزییـەوە ، بەم شێوەیەی ئێـستا پێشکەشی دەکەم .

لێـرەدا دەمەوێ ئەوەش بێنمەوە یاد کە جگە لە گەڕان و سۆراخی تایبەتیم بە کـتێبخانەکاندا ، بۆ ئەم کارە کەڵـکێکی زۆرم لە نامەی دوکتۆری مارۆسـتای بەڕێزم قەنـاتی کوردۆ « بەراوردکردنی رێزمانی دیالێـکتەکانی کوردی »[٣] ، وە لە پێشەکی کـتێبی « رێزمانی زمانی کـــوردی »ی[٤] ئی. ئی. تسوکەرمان وەرگرتووە . لەم چەندانەشدا کە بەرگـی دووەمی گۆڤاری نازداری « کـۆڕی زانیاری

---

(٢) مێژوی لـێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی ، رۆژنـامەی « برایەتی » ، ١٩٧٣ ، بەشی یەکەم ، ژ ٥٣ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٥٥ ، بەشـــی سێیەم ، ژ ٥٧ ؛ بەشی چوارەم ، ژ ٥٨ ؛ بەشی پێنجەم ، ژ ٦٠ .

(٣) قەناتی کوردۆ ، بەراوردکردنی رێزمانی دیالێـکتەکانی کوردی ( کرمانجی ژوورو و خوارو ) ، ( نامەی دوکـتۆری ) ، لە ژێر چاپدایە .

(٤) ئی. ئی. تسوکەرمان ، رێزمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

کورد » بڵاوکرایەوە وتارێکی د. جەمال نەبەزی تێدا بوو ، کە دەربارەی کوردناسییە لە ئەڵمانیادا (٥) و لە رێگای ئەم وتارەشەوە هەندێ زانیاری نوێم لە بارەی چەند کوردناسێکی ئەڵمانەوە وەرگرت .

بە پێویستی دەزانم ، سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە رابکێشم کە لەم نووسراوەدا پتر گرنگیم بەو کارانە داوە ، کە لە دەرەوەی وڵات نووسراون ، چونکە ئەو بەرهەمانە لە خوێندەوارانی کورد کەمتر ئاشکران ، وەك لەوانەی لە کوردستان نووسراون .

تاقە هیوام ئەوەیە بەم کارە توانیبێتم خزمەتێکی بچووك پێشکەش بە زانیاری کەلەکەمان بکەم و پڕ بە دڵ سوپاسی کۆڕی زانیاری کورد دەکەم کە ئەرکی بڵاوکردنەوەی گرتە ئەستۆی خۆی .

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

---

(٥) د. جەمال نەبەز ، کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، بەغدا ١٩٧٤ ، ل ٤١٣ ــ ٤٩٨ .

# لە سەرەتاوە تا شەڕی یەکەمی جیهان

سەرەتا و دەستپێکردنی لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی پەیوەستە و بەستراوە بە پەیدابوون و دەرچوونی یەکەم رێزمانی زمانی کوردی ( ماوریزۆ گارزۆنی Maurizio Garzoni ) یەوە لە سالی ۱۷۸۷ دا .[۱]

ماوریزۆ گارزۆنی ماوەی ۱۸ سالێك لە ناوچەی ئامێدی ژیاوە و زمانی خەڵکەکەی کردوە بە کەرەستەی کتێبەکەی . نوسەر ئەم کارەی بۆ مەبەستی ژاوێژ ( إستشارە ) داناوە ، وەك لە پێشەکیدا نوسیویەتی : « بۆ ئاسانکردنی ئیش و کاری راوێژکەرانە لە پەیوەندییاندا لەگەڵ کورددا » .

ئەم کتێبە لە کورتەیەکی رێزمانی زمانی کوردی و فەرهەنگێکی ئیتالی - کوردی پێکهاتووە ، ناوەرۆکەکەشی بریتییە لە : پێشەکی (ل ۱ - ۱۰) ؛ دەربارەی ئەلف و بێ (ل ۱۱ - ۱٦) ؛ ژمارە (ل ۱۷ - ۱۸) ؛ ناو (ل ۱۹ - ۲٦) ؛ کردار (ل ۲۷ - ٤٥) ؛ جەدوەلی جێناو (ل ٤٥ - ٥٠) ؛ ناوی وەرزەکانی ساڵ و رۆژانی

---

(۱) Maurizio Garzoni , Grammatica e vocabolario della lingua Kurda . Composti dal P. , Roma MDCCLXXXVII.

هەفتە و ئەندامانی لەش ... (ل ٥٤ ـ ٦٢)، هەندێ ڕستە بۆ گفتوگۆ (ل ٦٢ ـ ٧٤). لە کۆتایی ڕێزمانەکەدا وەك پاشکۆ فەرهەنگێکی ئیتالی ـ کوردی هەیە، کە نزیکەی (٢٢٠) لاپەڕە و پێنج هەزار وشەیەکە.

لەو بەشەدا کە دەربارەی ئەلف و بێیە نووسیویەتی دەڵێ: زمانی کوردی وفارسی بە ڕادەیەك لە یەکتر نێزیکن کە بە ئاسانی دەتوانرێ ئەلف و بێی فارسی بۆ زمانی کوردی بەکار بهێنرێ .. بەلام نووسەر هەڵەیەکی گەورەی کردوە بەوەی فارسی بە شێوەی ئەدەبی زمانی کوردی دادەنێ و وەك ئاشکرایە ئەو ڕایە لای ئێراننـاسان و کوردناسانی ئەم سەردەمە بێ سەر و شوێنە. هەرچەندە ئەم کتێبە وەك لە سەرەوە باسمان کرد بۆ مەبەستێکی تایبەتیە و کەم و کورتیشی هەیە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە دان بەوەدا بنێین کە ئەم کارەی م. گارزۆنی کە نزیکەی دوو سەد ساڵێك لەمەوبەر نووسراوە تەکو ئەمڕۆ بۆ لێکۆڵینەوە لە وشە و ڕێزمانی کوردی کەڵك و سوود و نرخی خۆی ون نەکردووە، وە لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە وا ئەم کتێبە، وەك پێشتر لێرخ نووسیویەتی، هەست و ئارەزوی زانایانی ڕۆژئاوای بزواند بۆ لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی و ئەوە بوو هەندێ لە ئێراننـاسان لە بارەی کتێبەکەی ماوریزۆ گارزۆنییەوە وتاریان نووسی و بلاویان کردووە و بەم چەشنە بناغەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی لە ڕۆژئاوا دانرا.

لە پاش ئەم کتێبەی م. گارزۆنی تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە

دەربارەی زمان و ڕێزمانی کوردی هیچ نوسراوێکی وەها پەیدا نەبو کە شایانی باس بێت . ئەوەی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا نوسرابێ و بڵاوکرابێتەوە تەنہا چەند وتارێکی هەندێ گەڕۆکن ، وەك : گ. گیورنلی ، ی ریودیگیر ، ئا. خۆدسکۆ ، ئی. بیریزین.... هتد . ناوەرۆکی ئەم وتارانە لە کتێبەکەی پیۆتر لێرخ ـ کوردناسی ڕوسدا بەر چاو دەکەوێت[٢] .

گ. گیورنلی ماوەیەکی درێژ لە کوردستاندا ژیا و فێری زمانی کوردی بو . لە ساڵانی ١٨٢٦ ـ ١٨٣٧ دا چەند وتارێکی ئەتنۆگرافی لە بارەی میللەتی کورد و دیالێکتەکانی زمانی کوردییەوە بڵاوکردوەوە[٣] . سەبارەت بە زمانی کوردی لەو ڕایەدا بوە کە : « زمانی کوردی لە دوَ دیالێکنی سەرەکی ـ خوارو و ژورو ـ پێکهاتووە . هەر یەکێکیان (دیالێکتێك ـ ئەوڕەحمان) دابەش دەبن بە سەر چەند بەشە دیالێکتێکدا ، وە هەر بەشە دیالێکتێکیش بە سەر چەند بەشێکی تردا . تیرەکانی موکری و هەکاری و شوکاك و بایەزید سەر بە دیالێکتی کرمانجی ژورون . ئەم چوار بەشە دیالێکتەش لقی جیاوازیان لێدەبێتەوە . ئەو تیرانەش کە لە هەرێمە شاخاوێکانی ڕۆژئاوا و خوارو و سەروی ڕۆژئاوادا ، هەر لە گۆمی ورمێوە تا سنە و لەویوە بۆ سلێمانی ، وە لە پاشا بە سەروی کەرکوك و ماردیندا تا

(٢) ب. لێرخ.، لێکۆڵینەوە لە بارەی کوردەکانی ئێران و خالدیێکانی باشوری باو باپیرانیانەوە ، پیترسبورك ، بەشی یەکەم ١٨٥٦ ، ل ٢٤ ـ ٣٦

(٣) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٧ ـ ٣٨ .

دیاربەکر و لەوێوە بـــۆ گـۆمی وان بڵاوبۆنەتـەوە ، هەروەهـا لە دیالێکتی کرمانجـیی ژورون » ... « تـــیرەکانی لەك و کرمانج و کەلهور و گۆران و لوڕ ، کە لە هەرێمە شـاخاوێـکانی زاگرۆس و خوارۆی سنە و کرماشان تا لوڕستان دەژین » ســـەر بە دیالێـکتی کرمانجی خوارون ... نۆسـەر لەو باوەڕەدا بوە کـە : دیالێـکتی کرمانجی ژورو و خوارو ئێجـگار لێك دورن ، بەڵام لە نیوانــ بەشە دیالێـکتەکان و لقەکانیاندا نێزیکی یەکی زۆر هەیە ، وە تیرەکانی ئەو بەشە دیالێـکتانەی کـە سەر بەیەك دیالێـکتن بە ئاسـانی لەیـەك دەگـەن . گ گیورنلی دەڵێ : « لە نیـوانــ دیالێـکتی کـرمانجی ژورو و خوارۆدا هەندێ جیاوازی لە تلفظ و وشـــە و دروست بــونی زماندا دەردەکەوێ »[٤] . وە دەربارەی خـــزمایەتـی زمانی کوردی و فارســـی نوسیویتی : تۆژینەوە و لێـکۆڵینـەوە و بەراوردکردن ئەوەیان سەلماندا کە نێـزیکی لە نیوان زمانی کوردی و فارسیدا هەیە .

ڕەسەنی و سەربەخۆیـی زمانی کوردی و نێزیکایـەتی لەگـەڵ زمانی فارسیدا لە لایەن گیورنلی ، وە زانـــایانی تری ئەڵمان ( ی. ریودیگیر و ئا. پۆت )ەوە بە چەند وتارێك چەسپێنرا و سەلماندرا .

لە بەراوردکردنی وشـــەدا لە نیوان زمانی کوردی و زمانە ئێرانێـکانی تردا ی. ریودیگیر و ئا. پۆت هاتنە سـەر ئەو باوەڕ و ئەنجامەی کە زمانی کوردی بە وشە و دەستوری زمانی یەوە بە زمانێـکی

(٤) ئەم چەند وشانەی گ گیورنلی لە کـتیبەکەی پ لیرخەوە وەرگرتووە ، بڕوانە : پ. لیرخ ، ب ١ ، ل ٣٧ ــ ٣٨ .

ڕەسەن و سەربەخۆی زمانە ئێرانیێـکانی دابنێن . هەروەها پەنجەیان بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە لە زۆردا زمانی کوردیی و فارسیی لە یەك زمانەوە پەیدا بوون و کەوتونەتەوە ، وە جیاوازییان زۆر کەم بوە ، بەلاّم لە دواییدا — واتە لە ئەنجامی پێشکەوتندا لێك دوور کەوتونەتەوە ، وە لە نیوان شێوەی پێشکەوتنی ئەم دوو زمانەدا جیـاوازیی هەیە لە جیابونەتەوەیاندا .

ئێراناسی بە ناوبانـگی رووس ئا. خۆدسکۆ لە ساڵی ١٨٥٣ دا هاتنی ئەحمەد خان ناوێـکی[٥] بە فرسەت زانیوە و خۆی بە فێربونی زمانی کوردییەوە خەریك کردوە و لە رێـگای ئەحمــەد خانەوە کەرەســتەی کۆکردۆتەوە و لە ئەنجامدا رێزمانێـکی کورتی زمانی کوردیی — شێوەی سلێمانیی داناوە[٦] . ئەم کتێبە بریتییە لە (٥٢) لاپەڕە کە (٢٠) لاپەڕەی دەربارەی ناو و ئاوەڵنـاو و جێناوە و (١٢)ی دەربارەی کردار و لە دوا بیست لاپەڕەشیدا هەندێ ڕستەی جیاواز و چەند شیعرێـکی نالیی تۆمارکردووە .

لە کۆتایی نیوەی دووەمی ســەدەی نۆزدەهەمــدا هەندێ لێکۆڵینەوەی زانستیی لە بارەی گەلی کورد و زمانی کوردییەوە لە لایەن زانایانی رووس و رووسیای قەیســەرییەوە ( ف. دیتێل ، خ.

---

(٥) وا دیارە ئەم ئەحمەد خانە لە بابانەکان بوە .

(٦) Chodsko A. Etudes Philologiques set la langue kurde (dialecte de Suleimanie), Jornal Asiatique , Avril - May , 1857 .

ئابۆڤیان ، ئی. بیریزین ، پ. لێرخ .... هتد ) بڵاوکرایەوە .

ف. دیتێل سێ ساڵێك بە کوردستاندا گەڕا و کەرەستەیەکی زۆری فۆلکلۆر و ئەتنۆگرافیـــای خڕکردەوە . زانای ناوبراو ، لە وتاری « سێ ســـاڵ گەڕان بە رۆژهەڵاتـدا »[۷] . دەربارەی ئەو کەرەستانە دواوە . لەم وتارەدا سـەبارەت بە کوردستان و زمانی کوردی و دیالێـکتەکانی نوسیویێتی : « لە گەڕانەکەمـدا — واتە لە دیاربەکرەوە تا سنووری ســـوریا — گەلێ مەسـەلەی جوگرافی و ئەتنۆگرافی سەرنجیان ڕاکێشام . رێـگاکەم بە ماردین و دیاربەکر و نەسـیبەین و ئورفەدا تێدەپەڕی . ئەو ناوچانەی کە من پیایاندا دەگەڕام بەشێـکی کوردستان بوون ، کە زۆر کەم ناسـراون . لەبەر ئەوەی تاکو ئێستا هیـچ کەرەستەیەکی ئەتنۆگرافی وەهامان نییە دەربارەی خێڵەکانی ئەم هەرێمەی ئاســـیا ، بۆیە لە لێـکۆڵینەوەی دیالێـکتەکانیـــدا ، بە تایبـەتی گرنـگی بە باری جوگرافی ناوچەکە دەدەم . لە کۆکردنەوەی ئەو کەرەسـتانەدا زۆر زەحمەتم کێشاوە . بەگوێرەی ئەو کەرەستەیەی لامە ، نزیکەی ( ۳۰۰ ) خێڵی کورد هەیە ، وە لەو باوەڕەدام کە لێـکۆڵینەوەی تەواو لە کوردســـتانی ئەمڕۆ یارمەتی ئەوەمان دەدا باشتر لە باری زۆی ناوچـەکە بگەین کە ئێســـتا بەشێـکە لە تورکیا ( مەبەســـتی دەوڵەتی عوسمانییە — ئەوڕەحمان ) »[۸] .... ف دیتێل کە دێتە سـەر باسی زمانی کوردی

(۷) بڕوانە : لۆڤـاری « وەزارەتی رۆشـنبیری میللی » ، بەشی ٤ ، پیترسبورك ۱۸٤۷ .

(۸) هەمان سەرچاوە ، ل ۹ .

دەڵێ : من بۆم دەرکەوت کە زمانی کوردی بە سەر زۆر دیالێکتدا دابەش دەبێت ، وە لەم ڕوەوە هێشتا کەس هیچی نەنوسیوە . بەشێکی کوردستان لە ژێر حوکمی تورکیادایە ، لەبەر ئەوە ، ئاشکرایە کە زمانی تورکی کاری کردۆتە سەر زمانی کوردی ، هەر وەك چۆن لە بەشەکەی ئێرانیشدا تاسیری زمانی فارسی هەیە .

پیۆتر لێرخ نوسیوێتی : ف. دیتێل وای نیاز بو کە هەندێ لێکۆڵینەوەی تایبەتی دەربارەی مێژوی کورد و زمانی و دیالێکتەکانی بڵاوبکاتەوە ، بەڵام مەرگ لەو نیازەی بێبەری کرد[9].

لە ساڵی ١٨٤٧دا لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی « قەفقاس » کە لە (تەلیس) دەردەچو زنجیرەیەك وتاری خ. ئابۆڤیان لە ژێر ناوی « کورد » دا بڵاوکرایەوە . لەم وتارانەدا گەلێ شتی بە کەڵك و نوێ لە بارەی ئەتنۆگرافیا و مێژو و ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕەوشت و نەریت و فۆلکلۆر و زمانی میللەتی کوردەوە بەرچاو دەکەوێ[10] .

ئەم نوسراوەی خ. ئابۆڤیان لە بارەی زمانەوانییەوە کاری کردە سەر بیر و ڕای زانایانی ڕوس ـ پ. لێرخ ، ف. یوستی ، س. یەگیزارۆف . . لە سەلماندنی ئەوەی کە زمانی کوردی زمانێکی ئێرانییە و لە خێزانی هیند و ئەورووپاییە . خ. ئابۆڤیان زمانی کوردی بەسەر کرمانجی و زازادا دابەش دەکات و داوا لە زانایانی

---

(٩) پ. لیرخ ، سەرچاوەی ناوبراو ، بەشی یەکەم ، ل ٣٨ ـ ٣٩ .

(١٠) بڕوانە : ڕۆژنامەی « قەفقاس » ، ژ ٤٦ ، ٤٧ ، ٤٨ ، ٥٠ ، ٥١ ، تفلیس ١٨٤٧ .

جیهان دەکات کە دەست بدەنە « لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی و لە نەتەوەی کوردی شۆڕەسوار » ... هەروەها دەڵێ : « لەم ڕێگایەوە دەتوانرێ گەلێکی ئێجگار زۆر بـــۆ ڕوونکردنەوەی مێژووی ئادەمیزاد ، وە گەلێك مەسەلەی زمانەوانی وەربگیرێ »[11] .

هەرچەندە ئەم زنجیرە وتارەی خ. ئابۆڤیان دەور و بەری (٣٠) لاپەڕەیەك دەبێت ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی زانستی و وردە .

(ی. بیریزین) ی ئێراناسی بەناوبانگی ڕووس کە پرۆفیسۆری زانکۆی (کازان) بوو لە کاتی گەڕانیدا بە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا فێری شێوەی کوردی خۆراسان و موسڵ بوو . شێوەی خۆراسان لە تاران فێر بوو ، ئەویـــش لە ڕێگای چەند کوردێکەوە بوو کە لە خۆراسانەوە بۆ تاران هـاتبوون . شێوەی موسڵیش لە موسڵ فێـر بوو . لە ئەنجامدا لە ژێـر ناوی « لێکۆڵینەوە لـــە دیالێکتەکانی فارسی » کتێبێك بلاودەکاتەوە[12] .

بێگومان ئەوەی ی. بیریزین لە بارەی ئەو دوو شێوەیەی کوردییەوە نوسیوێتی زۆر کەم و کورتە . بەکورتی لە ناو و جێناو و کردار دواوە ، وە لە پاشکۆی کتێبەکەیدا هەندێ وشە و ڕستەی ئەو دوو شێوەیەی کوردی نوسیوە .

ئەوەی سەرنج ڕابکێشێ و هەڵەی گەورەی ی. بیریزین بێت

---

(١١) هەمان سەرچاوە ، ل ٤٧ ، تفلیس ١٨٤٧ .

(١٢) E. Beresine , Reeherches sur les dialectes persans , Casan , 1853 .

ئەوەیە کە یەزیدییەکانی بە کورد نەژماردووە . بەڵام ئەوەی شایانی باسە ئەوەتە کە پ . لێرخ بێ هیچ گومانێك یەزیدییەکانی بە کورد داناوە و بۆ وەڵامی ی. بیریزین توسیوێتی : هەرچەندە سەرچاوەی گەورەی ئێمە سەبارەت بە یەزیدییەکان کتێبەکەی (ی بیریزین)ە ، بەڵام لە هەندێ شوێندا ڕای ئەو بە ڕاست نازانم ، بەتایبەتی کە یەزیدییەکانی ناو ناوە دراوسێکانی کورد ، لە بریتی ئەوەی بە یەك بنەماڵەیان دابنێ . ئێمە بە ڕای خۆمان و گەلێك زانادا شکمان لەو یەکێتییە نییە[13] .

لە ناو ئەو زانا روسانەدا کە بایەخیان بە کوردناسی داوە ، ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگ پیۆتر لێرخ جێگەیەکی تایبەتی و دیاری هەیە . لێرخ خاوەنی سێ کتێبی گرنگە لە بارەی کورد و کوردستانەوە[14] ، کە تا ئەمڕۆش لە کتێبخانەی کوردناسیدا هاوتایان کەمە و بە سەرچاوەیەکی رەسەن دەژمێررێن .

کتێبی یەکەم :

دوا بە دوای پێشەکێتی و باسی سروشتی کوردستان و دەوری کورد لە مێژوودا هاتۆتە سەر باسی زمانی کوردی و

---

(١٣) پ. لێرخ ، سەرچاوەی ناوبراو ، بەشی یەکەم ، ل ٤٠ .

(١٤) پ. لێرخ ، لێکۆڵینەوە لە بارەی کوردەکانی ئێران و خالدێکانی باشووری باو بابیرانیانەوە ، پیترسبورگ ، بەشی یەکەم ١٨٥٦ ، بەشی دووەم ١٨٥٧ ، بەشی سێیەم ١٨٥٨ .

لەم بەشـــەدا لە تێکڕای ئـــەو کارانە دواوە و کۆڵیـوەتەوە کە هەر لە زوەوە تا دەرچوونی کتێبەکەی ئەو لە بارەی زمانی کوردییەوە نوسراون ، وەك : م. گارزۆنی ، گ. گیورنلی ، ی. ریودیگیر ، ئا. پۆت ، ئا. خۆدسکۆ ، ف. دیتێل ، خ. ئابۆڤیان ، ئی. بیریزین .... هتد . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە لێرەدا پ لێرخ جگە لە خستنە ڕوی ئەم کارانە و ناوەرۆکەکانیان و ئاشکرا کردنی نرخی زانستییان ، هەروەها لە ڕێـگای ڕەخنە و لێـکۆڵینەوە و توژینەوەی تایبەتی و هەست کردنی خۆی بە شێوازێـکی ڕاست و ڕەوانـ و زانستی توانی ڕەسەنی و سـەربەخۆیی زمانی کوردی و نێزیـکایەتی لەگـەڵ زمانی فارســـی چەسپێنی و بسەلمێنێ ، وە گەلێك ڕای هەڵە و چەوتیش دور بخاتەوە . بە لای منەوە یەکێك لە رایە زانستیە هەرە گرنـگەکانی پ. لێرخ ئەوەیە کە لایەنـگیری ڕای ( ئا. پۆت )ی زانای ئەڵەمان دەکا لەوەی کە زمانی کوردی بە زمانێـکی ڕەسەن و سەربەخۆ دادەنێ ، وە بە یەکێك لە زمانە ئێرانیـکانی دەژمێرێت ، بەم بۆنەیەوە پ. لێرخ نوسیویەتی و دەڵێ : « زمانی کـوردی لە مەڵبەندی کوردستاندا سەربەخۆیی خۆی پاراست . هەرچەندە لەگەڵ زمانی فارسیدا خزمایەتی و نزیکایەتییانـ هەیە ، بەڵام لە شێوەی پێشکەوتندا لەگەڵ زمانی فارسیدا پەیوەندی نەبوە » ( ل ٣٣ ) .

کتێبی دوەم :

پ لێرخ کە لە نوسینی کتێبی یـەکەم بوەوە لە ڕێگـای ئـــەکادیمی زانستییەوە نێررا بۆ شـــاری ( روســـلاڤل ) ،

که نزیکەی (٢٠) بەندی کوردی لێ بو ، وە بۆ ماوەی سێ مانگێك لە ناویاندا مایەوە و خۆی بە فێربونی زمانی کوردییەوە خەریك کرد . ئەم بەندانە خەڵکی ناوچەی لەیەکتر جیاوازی کوردستان بون ، زوربەیان کرمانج و بەشێکیان زازا بون .

لە پێشەکیدا بە زمانێکی شیرین باسی بەسەر بردنی ئەو سێ مانگە و چۆنێتی پەیوەندی لەگەڵ بەندییەکاندا کردوە و لە بارەی فۆلکلۆر و رەوشت و نەریت و شێوەی جل و بەرگەوە دواوە .

دوا بە دوای ئەو باسانەی سەرەوە هاتۆتە سەر لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی ، وە ئەوەی لێرەدا گرنگ بێت ، ئەوەیە کە نوسەر هەر لە لاپەرەی یەکەمی ئەم باسەوە پەنجەی بۆ ئەوە راکێشاوە کە « پیتەکانی عەرەبی بۆ نیشاندانی دەنگەکانی کوردی بە تەواوی ناگونجین » (ل ٢٠) . بێشك ئەمەی ئەمرۆ ئێمە لە سەری کێشەمانە پ. لێرخ لە سەرەتای نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەدا هەستی پێکردوە و هەوڵی چارەسەر کردنی ئەم کارە و پڕکردنەوەی ئەو کەلەبەرەی داوە .

لە فۆنێتیکی زمانی کوردی بە باشی دواوە و لە دیارکردنی ژمارەی دەنگە بزوێنەکان ( vowels ) و کۆنسۆنانتەکان ( consonants )دا کۆششێکی زۆری کردوە و لە چۆنێتی تلفظ کردنی هەر دەنگێك و شێوەی دەربڕینی کۆڵیوەتەوە ، وە چەند جەدوەلێکی کردوە بۆ نیشاندانی شوێنیان لە چۆنێتی دەربڕیندا .

پاش ئەمانە کەوتۆتە باسی سەربەخۆیی و تایبەتێتی زمانی

کوردی له نێوان زمانه ئێرانیێکاندا . زمانی کوردی دابەش کردووه بەسەر پێنج دیالێکتدا : کرمانجی[(١٥)] ، لوڕی ، کەڵهوڕی ، گورانی ، زازا . لەم دیالێکتانەدا له کرمانجی ژووروو و زازا کۆڵیوەتەوه . دەربارەی دیالێکتی کرمانجی ژووروو نووسیوێتی : « هەموو کوردستانی ڕۆژئاوای داگیرکردوه — هەر له موسڵەوه تا ئاسیای بچووك و سلیمانی » .... سەبارەت به زازاش دەڵێ : « له بەراوردکردنی لەگەڵ کرمانجیدا وه یا لەگەڵ زمانه ئێرانیێکانی تردا ، گەلێك شتی تایبەتی چ له دەنگ و شێوەدا بەرچاو دەکەوێت که خەڵك دەهێننه سەر ئەو باوەڕەی زمانێکی جیاواز بێت » .... هەرچەنده ئەو جیاوازییه دەبینرێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا « زازا بەچکەی کرمانجییه » (ل ٢٢)[(١٦)] .

کتێبی سێیەم :

پ. لێرخ لەم بەرگەدا فەرهەنگێکی کوردی (کرمانجی ژووروو) — ڕووسی (ل ١ — ٨٤) ، وه کوردی (زازا) — ڕووسی (ل ٨٥ — ١٠٨) داناوه .

---

(١٥) مەبەستی دیالێکتی کرمانجی ژوورووه .

(١٦) بۆ وەرگرتنی پتر زانیاری له بارەی کوردی زازاوه ، بڕوانه : کورد ئەوەی میدێکانن ، (گۆزەن و لێکۆڵینەوەی د. کمال مەزهەر (به زمانی عەرەبی) ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، بەغدا ١٩٧٣ ، ل ٥٠٦ .

پ. لێرخ لەسەر بنکەی ڕەخنە لەو کارانەی لە زوّدا دەربارەی کورد و زمانەکەی نوسرابون، وە لە ڕێگای لێکوّڵینەوەی تایبەتی و تێکەڵاوی و هەست کردنی خوّی توانی بە شێوەیەکی زانستی لە بابەت کورد و زمانەکەی، ئەتنوّگرافیا و فوّلکلوّریەوە بنوسیّ .

ئەم وشە جوان و ڕاست و ڕەویانەی پ. لێرخ لە بارەی کوردەوە نوسیویەتی لە کاتێکدا بوە کە هێشتا لەو ڕوەوە لێکوّڵینەوە زوّر کەم بووە ، وە لە سەردەمێکدا وتراوە کە هەندیّ زانا زمانی کوردییان بە دیالێکتێك لە زمانی فارسی دادەنا . بیّ شك « ئەم نوسراوانەی پ. لێرخ سودێکی زوّریان بە لێکوّڵینەوەی نویّ لە ڕوسیا و ئەوروپادا بەخشی »[17] . . . وە لە ڕێگای کارەکانی . ئەم زانایەوە ، لە سەدەی نوّزدەدا کوردناسی بە شێوەیەکی سەربەخوّ کەوتە گەشە و پێشکەوتن[18] .

لەبەر ڕوّشنایی نوسراوی ی. بیرزین و پ لێرخدا لە سالانی ١٨٦٤ ـ ١٨٦٥دا زانای نەمسایی فردریك میوللەر کورتەی ڕێ ـ زمانی زمانی کوردی ( کرمانجی ، زوّرو و زازا )ی بڵاوکردەوە[19] ، وە

---

(١٧) ق. کوردوّ ، کارەکانی پ. لێرخ لە بارەی کوردناسییەوە ، « لە بابەت مێژوی ڕوّژهەلاتناسی ڕوسەوە » ، موّسکوّ ١٩٥٩ ، ب ٤ ، ل ٥١ .

(١٨) هەمان سەرچاوە ، ل ٥١ .

(١٩) F. Müller, Kurmanji - Dialekt der Kurdensmache, Wien , 1864 ;

هەروەها Zaza - Dialekt der Kurdensmache, Wien, 1865.

تیایدا لە فۆنێتیکی کرمانجی ژوورو و زازا و بەراوردکردنیان لەگەڵ فۆنێتیکی زمانی فارسی نوێدا ، وە ناو و جێناو و کردار دواوە.

هەرچەندە لەم کتێبی رێزمانەدا ناتەواوی زۆرە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی بەسوودە لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا ، وە بە تایبەتی لە نیشاندانی سەربەخۆیی و رەسەنیدا . بەم بۆنەیەوە لە پێشەکی کتێبەکەیدا نوسیویتی : بە هیچ جۆرێك زمانی کوردی لە زمانی فارسییەوە نەکەوتۆتەوە . هەرچەندە لە دەستوری زمان و فۆنێتیکدا زۆر وێکچوون هەیە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە زمانی کوردیدا گەلێك وشە هەن کە لە هیچ زمانێکی تری ئێرانیدا نین .

بۆ لێکۆڵینەوە لە کاری زمانە ئێرانیەکاندا فردریك میوللەر گرنگییەکی زۆری بە زمانی کوردی داوە. بەم بۆنەیەوە نوسیویەتی : لە لێکۆڵینەوەی زمانە ئێرانیەکاندا ، گرنگی نەدان بە زمانی کوردی دەبێ بە کەم و کورتی و ناتەواوی لە لێکۆڵینەوەکەدا .

ئا. ژابا کە قونسولی ئیمپراتۆریەتی رووس بو لە تورکیا (ئەرزرۆم) ـ سالی ١٨٣٦ ـ ١٨٦٩ ـ لەسەر داوای ئەکادیمی ب. ئا. دۆرن دەستی کرد بە فێربون و لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی و کۆکردنەوەی کەرەستە لە بارەی ئەدەب و فۆلکلۆر و زمان و ئەتنۆگرافیای کوردەوە بە گشتی ، وە دەستنوس کوردی بە تایبەتی . لە بەجێهێنانی ئەم کاردا مەلا مەحمودی بایەزیدی یارمەتیەکی زۆری ئا. ژابای داوە و گەلێك بەرهەمی کوردی بۆ نوسیوەتەوە و زۆری لە فارسییەوە بۆ وەرگێڕاوەتە سەر کوردی .

١٠٨٠٥

له ئەنجامدا ئا. ژابا کۆمەڵێك دەستنوسی بەنرخ و نایابی کۆکردەوە کە ئێستا لە کتێبخانەی گشتی و کتێبخانەی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت هەڵگیراون[٢٠] .

له سالی ١٨٦٠دا ئا. ژابا لە ژێر ناوی « جامع‌ی رسالیان و حکایتان بزمانی کورمانجی » بە زمانی کوردی و فەرەنسی هەندێ چیرۆکی کوردی لە چاپ دا[٢١] و هەندێ سەرنجی دەربارەی ئەدەبی کوردی نیشان داوە . لە لێکۆڵینەوەی مێژوو و ئەتنۆگرافیا و زمانی کوردیدا بۆ کوردناسان ، ئەم کتێبە تاکو ئێستا هەر بە نرخ و بە سوودە[٢٢] .

جگە لەوە ئەم زانایە کارێکی گەورە و خزمەتێکی بێ‌ئەندازەی کردووە لە نوسینی ڕێزمان و فەرهەنگی کوردیدا . بەداخەوە زۆری

---

(٢٠) لە بارەی ئەو دەستنوسانەوە ، نوسەری ئەم نامیلکەیە لە لاپەڕە ٩ - ١٠ ی ، ژمارە ١٠ ی ، سالی ١٩٧٣ ی ، گۆڤاری « بەیان »دا ، لە ژێر ناوی « چەند وشەیەك دەربارەی کۆمەڵە دەستنوسە کوردییەکانی ئەلێکساندر ژابا » دا بلاوکردۆتەوە و تیایدا لە نێفگرایی دەستنوسەکانی زانای ناوبراو دواوە .

(٢١) ئا. ژابا ، جامع‌ی رسالیان و حکایتان بزمانی کورمانجی ، پیترسبورگ ١٨٦٠ .

(٢٢) بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو سەبارەت بەم کتێبە ، بڕوانە : ئەو زنجیرە وتارەی کە کاك عەبدولا حەداد لە چەند ژمارەیەکی مانگی شوباتی ١٩٧٣ی ڕۆژنامەی « التآخی »دا لە ژێر ناوی « درة ثمینة من التراث الثقافی الکردی »دا بلاوی کردۆتەوە .

کارەکانی هێشـــتا هەر بە دەســـتنوسی ماونەتەوە . یەکێك لـەو دەستنوسانەی کە شایانی باســـە ئەو ڕێزمانەیە کە بە هاوکاری مەلا مەحمودی بایەزیدی نوسیویەتی[٢٣]. ئا. ژابا خاوەنی یەکەم فەرهـەنگی کوردی ـ فەرەنسایی‌یە کە لە پاش خۆی بـــە فەرمانی ئەکادیمیـەی ڕوسی لە ساڵی ١٨٧٩ دا فێردنیاند یوستی بڵاوی کردۆتەوە[٢٤]. ئەم فەرهەنگە بریتییە لە (٤٦٣) لاپەڕە و (١٥) هەزار وشەی کوردی کە جگە لە لێکدانەوە و شەرح کردنیان لە داڕشـــتن و دروست بون و پەیدابونیان کۆڵیوەتەوە و هەروەها لەگەڵ وشـــەکانی فارسی و عەرەبی و تورکیدا بەراوردی کردون .

س ری ـ میسیۆنێری ئەمەریکی ماوەیەکی درێژ لـە ناوچەی هەکاری ژیا و لـــە ساڵی ١٨٧٢ دا کتێبێکی بچوکی ڕێزمانی زمانی کوردی نوسی[٢٥]. ئەم نوسراوە نزیکەی (٥٠) لاپەڕەیەك دەبی ، کە بە کورتی لە فۆنێتیـك و مۆرفۆلۆژی زمانی کوردی دواوە و لـە پاشکۆی کتێبەکەیدا فەرهەنگۆکێـکی کوردی ـ ئنگلیزی داوە ، کە (٢٠) لاپەڕەیەك دەبێت .

---

(٢٣) ئەم دەستنوسە لە ئەرشیفی کتێبخانەی گشتی لینینگرادە .

(٢٤) A. Jaba, Dictionniare kurde - francais, St - Peter - bourg, 1879.

(٢٥) S. A. Rhea, Brief Grammar and Vocabulary of Kurdish Language of the Hakkari districh, Jornal of the American Oriental Society, v. x, New - Haven, 1872.

له ساڵی ١٨٨٠دا ئێرانناسی بەناوبانگ فێردیناند یوستی کتێبێکی ڕێزمانی کوردیی بڵاوکردەوە[٢٦] و لەم کارەیدا کەڵکێکی زۆری لە بەرهەمەکانی : م. گارزۆنی ، ئا. خۆدسکۆ ، س. ری ، پ. لێرخ ، ئا. ژابا .... وەرگرتوە .

فەسڵی یەکەمی ئەم ڕێزمانەی باسی فۆنێتیکە (ل ١ ـ ١٠١) . لە لێکۆڵینەوەی دەنگە بزوێنەکاندا لە نیوان درێژی و کورتی تلەفظ کردنی هەر یەك دەنگدا جیاوازیی کردوە و بە دەنگێکی جیاوازی داناوە ، وە ئەمە بوە بـە هۆی ئەوەی دەنگە بزوێنـەکان لـە نوسراوەکەی ئەودا ژمارەیان پتر بێت لەوەی کە لـە واقعی زمانی کوردیدا هەیە .

لە بەشی وشە داڕشتندا (ل ١٠٢ ـ ١٢٢) دەربارەی پێشگر و پاشگر و وشـەی مرکب .... دواوە . فەسڵێکی تایبەتی لە بارەی مۆرفۆلۆژییەوەیە (ل ١٢٢ ـ ١٤٥) و لە ناو و جێناو و ئاوەڵناو و کردار کۆڵیوەتەوە . دوا فەسـڵی لـە بابەت سینتکسیـەوەیە (ل ١٤٦ ـ ٢٥٦) .

ف. یوستی لە لێکۆڵینەوەکەیدا هـەوڵی بەراوردکردنی زمانی کوردیی لەگەڵ زمانە ئێرانیێکانی تردا داوە . هەرچەندە ئەمە کارێکی ڕاستـە ، بەڵام وەك ق. کوردۆ دەڵێ : « ناتەواوی ف. یوستی لەوەدایە کە تەنها چمکێکی بەراوردەکەی گرتوە »[٢٧] — واتە تەنها

(٢٦) F. Justi, Kurdishe Grammatik., S. - Pb, 1880.

(٢٧) ق. کوردۆ ، بەراوردکردنی ڕێزمانی دیالێکتەکانی کوردی ، ( نامەی دوکتۆری ) ، ل ١١ .

بەراوردی ویـکچوونی ئەو دوو زمانەی کردوە . لەبــەر ئەوە لەم لێـکۆڵینەوەیەدا نووسەر نەیتوانیوە خاسـیەتی ناوخۆی زمانی کوردی نیشان بدا . جا لە لێـکۆڵینەوەی دەستووری زمانێکدا ، ئەگـەر خاسـیەتی تایبــەتی ناوخۆی ئەو زمانە نیشان نەدرێ ئەوە ئەو لێـکۆڵینەوەیە لە واقع دوور دەکەوێتەوە .... هەروەها ناتەواوی ئەم کتێبە لەوەشدایە کە نووسـەر لە هێنانەوەی نموونەدا وشەی لە زمانی کوردی خۆیەوە وەرنەگرتووە ، بەڵـکو لە فارسی کۆن و زمانە ئێرانیـکانی تردوەی دەرهێناوە . لەگەڵ ئەو هەموو کەم و کورتیانەشدا ئەم کتێبە یەکێـکە لە کارە هەرە بەرزەکانی پێش سەدەی بیست لە بارەی زمانی کوردییەوە .

لەبەر ڕۆشنایی ئەو زێزمانەی ف. یوستی کە لەسـەرەوە باسمان کرد (هۆتوم شیندلەر)ی زانای ئەڵمان لە ساڵانی ١٨٨٤ — ١٨٨٨ دا لە بارەی گەنجینەی وشــەی کوردییەوە ، ئەنجامی لێـکۆڵینەوەکانی خۆی بە دوو بەرگ پێشکەش کرد(٢٨) . ئەم زانایە وشەی گەلی شێوەی کوردی ، بە تایبەتی موکری کۆکردۆتەوە(٢٩) .

نزیك کـۆتایی سـەدەی نۆزدە ڕۆژهەلاتناس ئــا سۆتسین

(٢٨) Houtum - Schindler , Beiträge Zum Kurdishen Wortschatz , Leipzig , 1884 und 1888 in ZDMG , BD . 38 , S . 43 - 116 , und BD . 42 , S . 73- 79 .

(٢٩) هەروەها بڕوانە : د جەمال نەبەز ، کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٢ ، بەغدا ١٩٧٤ ، ل ٤٢٤ — ٤٣٥ .

کتێبێکی لە بارەی زێزمانی کوردییەوە بڵاوکردەوە[٣٠] کە بناغەکەی لەسەر . ئەو کەرەستەیە دازێژراوە کە کاتی خۆی لەگەڵ (ی. پرایم)دا بە جوتە کۆیان کردۆتەوە و چاپیان کردوە[٣١] .

ئــەم کـتێبی زێزمانە (١٦) لاپەڕەی دەربارەی فۆنێتیك و (١٥)ی ـ مۆرفۆلۆژیایە . لە بەشی مۆرفۆلۆژیدا بە زۆری لە ناو و جێناو و کردار دواوە . لە هەندێ حاڵاتی گۆڕینی وشەدا دەستوری زمانی فارسی بەسەر کوردیدا ســەپاندەوە و ئەمەش توشی هەڵەی کردوە .

لە کتێبەکەی س. ئا. یەگیزارۆفدا کە دەربارەی ئەتنۆگرافیای کورد نوسیوێتی[٣٢] چاومان بە هەندێ مەسەلەی گرنگی زێزمانی زمانی کوردی و هەروەها دوو فەرهەنگ دەکەوێ : یەك ـ کوردی ـ ڕوسی (ل ١ ـ ٦٥) ؛ دوو ـ ڕوسی ـ کوردی (ل ٦٦ ـ ١٢٢) . یەکەم دەور و بەری سێ هەزار ، دووەم ـ چوار هەزار وشەیەکە .

(هـ مەکەس) کە کارگێڕی کـتێبخانەی زانکۆی ڤیەنا بو لە

---

(٣٠) A. Socin , Die Sprache der Kurden , « Grundriss der iranischen Philologie » , Bd. 1 , 2 Abt.

(٣١) Prym und A. Socin , Kurdische Sammlungen , Abt , I , II , S. Pbg , 1887 - 1890 .

(٣٢) سی ئا. یەگیزاروف ، میژوبەیەکی ئەتنوگرافی کورتی کوردی موحافەزەی یەریڤان ، « هەواڵەکانی لقی قەفقاسیای کۆمەڵی جوگرافی ڕوسی ئیمپراتوری » ، تفلیس ١٨٩١ .

سالی ۱۹۰۰دا لەبەر ڕۆشنایی شیلاەی کوردی دیاربەکر و شێوەی یەزیدییەکان ئاڵکۆڵینەوەیەکی لە ٥ باری زمانی کوردییەوە بڵاوکردووە[٣٣] ، [٣٤] .

لە سالی ۱۹۰٤دا دێ مۆرگان بە زمانی فەرەنسی نوسراوێکی دەربارەی شێوەکانی زمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە[٣٥] . لێرەدا باسی یازە شێوەی ( موکری ، گەڕوسی ، یەزیدی بایەزیدی ، سەحنەیی ، کرماشانی ، هەورامانی ، جافی ، زەڕاوی ، سلیمانی ، لەکی ، خۆجەوەندی ) کردووە و لەگەڵ یەك بەراوردی کردون . نوسەر بە شێوەیەکی فراوان ـ واتە لە ( ۱۹٤ ) لاپەڕەی گەورەدا لە گەلێك کێشەی فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی و کەرەستەی وشە کۆڵیوەتەوە .

ئۆسکارمان لە سالی ۱۹۰٦ دا کتێبێکی نایابی لە بارەی شێوەی موکرییەوە بڵاوکردەوە[٣٦] ، کە ئەنجام و بەرهەمی ئەو دو ساڵ و نیوەی بووە کە لە ناو هۆز و خێڵە کوردەکانی ئێراندا ژیاوە . نوسەر بەم بۆنەیەوە لە پێشەکیدا نوسیویتی دەڵی : « لە سالی ۱۹۰۱ تا

---

(٣٣) H. Makas , Kurdishe Studien , Heidelberg , 1900 .

(٣٤) هەروەها بڕوانە : د. جەمال نەبەز ، کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ۲ ، بەغدا ۱۹۷٤ ، ل ۱٤٤ .

(٣٥) J. De Morgan , Etudes Linguistiques Dialectes Kurdes , Paris , 1904 .

(٣٦) O. Mann , Die Mundart der Mukri - Kurden , Teil I , Berlin , 1906 .

١٩٠٣ بە فەرمانی خاوەن شکۆ ئیمپراتۆری دەوڵەتی نەمری ئەڵمان بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو زمانانەی لەسەر زاری هۆزەکانی جۆر بە جۆری وڵاتەکانی ئێستا باون و پەیوەندییەکی زۆریان لەگەڵ زمانەکانی کۆنی ئەو ناوچەیەدا ، وەك (فارسیی کۆن ، پەهلەویی) هەیە و کە لە رۆژگاری پێشدادییەکان و ساسانییەکاندا زمانی خەڵکی وڵات بوون ، بۆ مەڵبەندەکانی ئەو وڵاتە چووم . لە پاش ئەنجامدانی ، خۆم بەرهەمی زانیارییەکانی خۆم پێشکەش دەکەم لە تەواوی ماوەی ئەو دوو ساڵ و نیوەدا لە ژێر سێبەری خاوەن شکۆ مظفرالدین شای قاجار ـ شاهنشای وڵاتەکانی ئێران کە موڵك و پادشـــایەتی بەردەوام بێ ، وە بە هاوکاری و یارمەتی حاکمەکانی ئەو مەڵبەندانە زۆر بە ئاسایشـــەوە لە ناو هۆز و عەشـــیرەتەکانی کورد و لوڕدا مامەوە و تا فەرمانی ئیمپراتۆر و خزمەت بە جیهـانی زانست و مێژوو و زمانـ خۆش بەختانە ئەو خزمەتە خاوێنەم ئەنجام دا » .

ئەم کـتێبە بریتییە لە (٤٠٨) لاپـەڕە . لە (١٠٦) لاپـەڕەی پێشەوەیدا لە ڕێزمانی زمانی کوردیی (فۆنێتیـــك ، مۆرفۆلۆژی ، سینتکیس) دواوە : فۆنێتیك (ل ٢٤ ـ ١٦) ـ لێرەدا هەندێ سەرنج و ڕای لە بارەی دەنگی بزوێن و کۆنسۆنانت و لێکدراو ( diphthong ) و شێوەی نووسینیان دەربڕیوە . لە بەشی مۆرفۆلۆژیدا (ل ٤٧ ـ ١٠٤) لە گەلێك کێشەی ناو و ئاوەڵناو و جێناو و کردار و پێشـگر و پاشگر . . . کـۆڵیوەتەوە و گەلێك نموونەی جوان و ڕاستی هێناوەتەوە . لە (ل ١٠٥ ـ ١٠٦) یشدا بە کورتی لە سینتکـیس دواوە .

شایانی باسە کە (٣٠٢) لاپەڕەی ئەم کتێبە تەرخان کـراوە بۆ

کەرەستەی فۆلکلۆری کوردی و لەم بەشەدا گەلێك داستان و چیرۆکی وەك ، مەم و زین و زەمبیل فرۆش و ناسر و ماڵماڵ و بەیتی ئەوزەحمان پاشـای بەبە ... هتـدی کۆکردۆتەوە و ئەم تێکستانەی بـە پیتی عەرەبی و لاتینی و وەرگێڕانی ئەڵمانییەوە بڵاوکردۆتەوە . ئەوەی ئۆسکارمان کۆی کردۆتەوە شتێکی کەم هاوتایە و بەمە نەك هەر سامانی فۆلکلۆری کوردی لە فەوتان ڕزگار کردوە ، بەڵکو ئەوەی ئەو تۆماری کردوە کەرەستەیەکی ئێجگار بە نرخە بۆ لێکۆڵینەوەی زمان ، بە تایبەتی لە چۆنیێتی پیشکەوتن و بەراورددا .

ئەم زانایە لە ساڵی ۱۹۰۹ شدا کتێبێکی تری لە بارەی زمانی کوردییەوە لە چاپ دا[۲۷] . ئەم کارە ( ۵۲۹ ) لاپەڕەیە : لە ( ۵۱ ) لاپەڕەی سەرەتادا ، بە تایبەتی سەبارەت بە شێوەکانی کوردی و زمانی گفتوگۆی ناوچەی ڕۆژهەلاتی کوردستان دواوە . وە لە ( ٤۷۸ ) لاپەڕەشدا کەرەستەیەکی زۆر و نایابی فۆلکلۆری کوردی تۆمار کردوە .

ئەم دوو کتێبەی ئۆسکارمان دەورێکی باشیان لە کوردناسیدا بینیوە و سەرچاوەیەکی بە نرخ و ڕەسەنن بۆ لێکۆڵینەوەی زمان و فۆلکلۆری کوردی بەگشتی و شێوەی موکری بە تایبەتی .

---

(۲۷) O. Mann , Die Mundart der Mukri - Kurden , Teil II , Berlin , 1909 ,

له سالی ۱۹۱۳ دا کتێبی ڕێزمانی مێجەر سۆن دەرچو[۳۸] .

لەم کتێبەدا نوسەر هەوڵی داوە کە سنوری مۆرفۆلۆژی و وشە لە نێوان دیالێکتی کرمانجی ژورو و خوارودا بکێشێ .

لە پێشەکیدا زمانی کوردی بەسەر چوار دیالێکت (کرمانجی ، گورانی ، لوڕی ، زازا)دا دابەش دەکات ، هەروەها کرمانجیش بەسەر ژورو و خوارودا .

ڕێزمانەکەی سۆن لە سێ بەش پێکهاتووە :

بەشی یەکەم — فۆنێتیك (ل ۱ — ٦) و مۆرفۆلۆژی (ل ٦ — ٩٤) .

بەشی دووەم — سینتکسیس (ل ٩٥ — ١١٢) . هەر لەم بەشەشدا هەندێ فۆلکلۆر و شیعری کوردی بە کرمانجی ژورو و خوارو تۆمار کردوە و وەری گێڕاونەتە سەر زمانی ئنگلیزی (ل ١١٣ — ١٦٠) .

بەشی سێیەم — بریتیە لە فەرهەنگێکی ئنگلیزی — کوردی (ل ١٧٠ — ٢٨٩) ، کە زوربەی وشەکانی کرمانجی ژورون .

هەرچەندە لە کوردناسیدا بۆ یەکەم جارە کە سۆن هەوڵی بەراوردکردنی دیالێکتی کرمانجی ژورو و خوارۆی داوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەوە لە بیر نەکەین کە بە شێوەیەکی زانستی بۆ ئەم مەسەلەیە نەچوە و هەڵە و ناتەواوی لەو بەراوردکردنەدا هەیە .

---

(۳۸) E. B. Soane , Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language , London , 1913 .

مێجەر سۆن لە ساڵی ١٩١٩شدا لە بەغدا لە ژێر ناوی (Elementary kurmanji grammar)دا کتێبێکی تری بڵاوکردەوە[٣٩]. ئەم نوسراوە (٨٦) لاپەڕەی لە بارەی زێزمانەوەیە و زوربەی لەسەر مۆرفۆلۆژییە. وەك پاشکۆش فەرهەنگۆکێکی ئنگلیزی — کوردی نوسیوە کە نزیکەی (٧٠) لاپەڕەیەك دەبێت.

* * * * * *

---

(٣٩) E . B . Soane , Elementary kurmanji grammar , Baghdad , 1919 .

# پاش شەڕی یەکەمی جیهان

## لە کوردستان:

لە ناوەڕاستی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەورێکی نوێی لە مێژوی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا دەست پێدەکات. ئەمەش یەکێک بو لە ئەنجامەکانی قوڵ بونەوەی هەستی نەتەوایەتی کە یەکێک لە بەرهەمە ڕۆشنبیرییە گرنگەکانی بریتی بو لە بایەخ پێدانی خوێندەوارانی کورد خۆیان بە لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەب و مێژوی گەلەکەیان. لە چاپەمەنی کوردی ئەو سەردەمەدا گەلێک وتار و لێکۆڵینەوە لە بارەی ڕێزمانی زمانەکەمانەوە بەدی دەکرێت، جگە لەوەی چەند کتێبێکیش هەر لەم بارەیەوە بڵاوکرایەوە. ئەوەی لێرەدا پێویستە سەرنجی بۆ ڕابکێشین ئەوەتە کە چەند هۆیەکی مەوزوعی ئاشکرا کارێکی وەهایان کرد کوردستانی عێراق ببێتە مەڵبەندی ئەم بزوتنەوە نوێیە لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا. هەندێ لە مامۆستایان بونە پێشەنگی ئەم قافلە پڕ شانازییەی ژیانی ڕۆشنبیری نەتەوەی کورد. شاگردانی ئەو مامۆستا

بەرێزانەش دلسۆزانە و بێبەشق هەر یەکەیان لە سنوری توانای خۆیاندا خزمەتێکی زۆر و شایانیان لەم مەیدانەدا کردووە .

لە ساڵی ١٩٢٨دا لە ژێر ناوی « مختصر صرف و نحوی کوردی »دا کتێبی مامۆستا سەعید صدقی کابان لە چاپ درا[1]. ئەم نوسراوە کە (٧٦) لاپەڕەیە بە کورتی لە هەندێ کێشەی گرنگی ڕێزمانی کوردی دواوە و ئەوەی زیاتر سەرنج ڕابکێشی ئەوەیە کە یەکەم کتێبی ڕێزمانی کوردییە کە نوسەرەکەی کورد بێ و بە زمانی کوردی نوسرابێ و لە کوردستان دانرابێ . ئاشکرایە ، کە بەمە مامۆستا سەعید کابان یەکەم بەردی بناغەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی لە کوردستاندا دانا و بێشك ئەگەر کەم و کورتیش لە نوسراوەکەیدا هەبێت وەك تەجروبەی یەکەم جێگەی ڕەخنە نییە و لەم بارەیەوە نوسەر لە پێشەکیدا دەڵێ : « هتا ئەم عصر اخیرە خویندنمان لە مکتبا و نوسینمان بە کوردی نەبوە بەو سببە سعی و کوشش نەکراوە کە قواعدیکی صرف و نحو بو زبان کوردی ریك بخری . وقتی لە طرف معارف و ملت پرورانەوە تدریسات مکتب و نوسین مکاتیب کران بە کوردی لازم ، بلکو واجب بو کە قواعدی بو زبان ، بو نوسین کوردی دابمەزرینری چونکو قواعد نەبی اصول نوسین و املا نازانری . هر لە بری قواعدی‌یە یك کلمە دەبینری کە بە انواع مختلف دەنوسری .

لەبەر ئەوە من کە فردیکی بچوکم لە افراد ملت وا بە کمال

(١) سعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ١٩٢٨ .

ادب و كردن كەچی ئەمە رسالە مختصرە كە بو قواعد زبان و نوسین كوردی ریكانشان دەرە تقدیم ملت كورد و اولاد وطـــنی دەكەم ، بشرف ئەم خزمەتەوە خوم لە سعادتـكی ابدیدا دەبینم . لكن رجا لە علما و منوران دەكەم كە بە قلم لطف و مرحمت تصحیح قصوری ، و اكمال نقصانی بفرمون . چونكو اول تالیفە . . »[۲] .

وەك ئاشكرایە ماوەیەكی زۆر بەسەر نوســـینی ئـەم كتێبەدا تێپەڕیوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە سەرچاوەیەكی ڕەسەن دەژمێررێت لە لێكۆڵینەوەی ڕێزمانی كوردیدا و هەروەها نوسراوێكی دێرینی كوردی بەنرخە لە نیشاندانی جۆری نوسین و گفتوگۆی كـوردی ئەو دەمە و شێوەی پێشكەوتنیدا .

ساڵی ۱۹۲۸ زانای گەورە و ناسراوی كورد مامۆسـتا تۆفیق وەهبی كتێبی « دەستوری زمانی كوردی » لە چاپ دا[۳] ، وە ساڵی ۱۹۳۳ بە ناوی « خوێندەواری باو » ەوە كتێبێكی تری بڵاوكردەوە[٤] ئەم دوو بەرهەمەی مامۆسـتا تۆفیق وەهبی لە مێژوی لێكۆڵینەوەی زمانی كوردیدا دەورێكی گەورەیان بینیوە و تاكو ئەمڕۆش كەڵك و سودیان هەر بەردەوامە ، بە تایبەتی كتێبی « خوێندەواری باو » ، كە بە شێوەیەكی گشتی باسی چەشن و كاری پیتەكان و چۆنێتی نوسینی كوردی بە لاتینی دەكات . لێرەدا نوسـەر (۸) دەنـگی بزوێن و

(۲) هەمان سەرچاوە ، ل ۲ .

(۳) تۆفیق وەهبی ، دەستوری زمانی كوردی ، بەغدا ۱۹۲۸ .

(٤) تۆفیق وەهبی ، خوێندەواری باو ، بەغدا ۱۹۳۳ .

(٢٥)ی گۆنسۆناتی دەست نیشان کردووە و دەنگی (y)شی بە نیمچە بزوێن داناوە .

جگە لەو دوو کتێبە لە سالانی ٤٠دا مامۆستا تۆفیق وەهبی لە گۆڤاری «گەلاوێژ»دا چەند وتارێکی بە نرخی بلاوکردەوە ، وە لە سالانی پەنجادا بە زمانی عەرەبی کتێبی رێزمانی زمانی کوردی لە چاپ دا[٥] . ئەوەی شایانی باسە ئەوەتە کە مامۆستا تۆفیق وەهبی تا ئەمرۆش لەم مەیدانە سەختەدا هەر خەریکی لێکۆلینەوە و رازاندنەوەی کتێبخانەی زانستی کوردییە بە بەرهەمە بەهادارەکانی .

لە سالانی ١٩٤١ — ١٩٤٢دا جەلادەت عالی بەدرخان لە گۆڤاری «هاوار»دا کە لە سوریا دەردەچوو زنجیرەیەك وتاری لە بارەی رێزمانی کوردییەوە بلاوکردەوە[٦] ، وە لە سالی ١٩٥٣شدا لە پاریس کتێبێکی رێزمانی کوردی (دیالێکتی کرمانجی ژوورو)ی نوسیوە[٧] .

مامۆستا نوری عەلی ئەمین دەربارەی رێزمانی کوردی بە شێوەیەکی فراوان ، یەك لە دوای یەك چەند کتێبێکی دەرکرد :

---

(٥) تۆفیق وهبي ، قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول و الجزء الثاني ، بغداد ١٩٥٦ .

(٦) جەلادەت عالی بەدرخان ، گرامەرا کرمانجی ، گۆڤاری «هاوار» ، ژ ٢١ ، ٢٨ ، ٢٩ ، ٣٠ ، ٣٢ ، ٣٣ ، ٣٤ ، ٣٥ ـ ی ١٩٤١ ؛ ژ ١٠ ، ٣٤ ، ٤٠ ، ٤٢ ، ٤٣ ، ٤٤ ، ٤٥ ـ ی ١٩٤٢ .

(٧) Dr. Kamûran Alî Bedr - Khan, hangue Kurde, I, II, Paris, 1953.

سالی ١٩٥٦ بەرگی یەکەم و سالی ١٩٥٨ بەرگی دووەمی کتێبی «قواعدی زمانی کوردی» بڵاوکردەوە[٨]، هەر لە ساڵی ١٩٥٨دا کتێبێکی تری زێزمانی کوردی بە ناوی «گرتنی کەلێنێکی تر لە زێزمانی زمانی کوردیدا» لە چاپ دا[٩]، وە سالی ١٩٦٠یش کتێبێکی (٢٠٠) لاپەڕەیی نوێی پێشکەش بە خوێنەرانی کورد کرد[١٠].

لە چاپدانی ئەو چەند کتێبەی مامۆستا نوری عەلی ئەمین پێشکەوتنێکی گەورە بوو لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا. ئەم نوسراوانە چ لە ڕوی زۆری بەکار هێنانی کەرەستەی زمان و شێوەی داڕشتنیەوە وچ لە ڕوی فراوانی و وردییەوە سەرکەوتووە و بە باوەڕی من لەو کتێبانەدا بۆ یەکەم جار توانراوە لە هەندێ مەسەلە بکۆڵرێتەوە کە زۆ باسیان لێوە نەکراوە.

پاش ئەوەی مامۆستا نوری عەلی ئەمین ئەو چەند نوسراوەی لە سەرەوە باسمان کردن بڵاوکردەوە، ئینجا لە ساڵی ١٩٦٦دا کتێبی «ڕابەری بۆ ئیملای کوردی» لە چاپ دا[١١]. نوسەر لەم کتێبەدا

---

(٨) نوری عەلی ئەمین، قواعدی زمانی کوردی، بەرگی یەکەم، بەغدا ١٩٥٦، بەرگی دووەم ١٩٥٨.

(٩) نوری عەلی ئەمین، گرتنی کەلێنێکی تر لە زێزمانی زمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٥٨.

(١٠) نوری عەلی ئەمین، زێزمانی کوردی، سلیمانی ١٩٦٠.

(١١) نوری عەلی ئەمین، ڕابەری بۆ ئیملای کوردی، بەغدا ١٩٦٦.

له تێکرایی دەنگەکانی زمانی کوردیی دواوە و لە ئەنجامـدا (١٢)ی بزوێن و (٢١)ی کۆنسۆنانتی دیار کردوە ؛ لە بارەی دانەی دەنگی (فۆنێم phoneme)یەوە هەندێ بیر و ڕای دەربڕیوە ؛ لە چۆنێتی نوسینی کوردیی کۆڵیوەتەوە و تا ڕادەیەك ئەم باسەی شی کردۆتەوە .

ئەو نامیلکەیەش کە مامۆسـتا جەمال نەبەز لە ساڵی ١٩٥٧دا لە ژێر ناوی « نوسینی کوردیی بە لاتینیی »دا بڵاوی کردۆتەوە[١٢] پەیوەندیی بە کێشەی ئیملای کوردییەوە هەیە . مامۆستا نەبەز لەم بەرهەمەیدا بە شێوەیەکی زانســـتیی لە چۆنێتی نوسینی کوردیی بە لاتینیی دواوە و شایانی باسـە کە لەم بارەیەوە هەندێ کاری ئاڵۆزی خاو کردۆتەوە .

ساڵی ١٩٦٨یش مامۆســـتا أ. ب. هەوری نامیلکەیەکی ( ٤) لاپەڕەیی دەربارەی نوســـینی زمانی کوردیی بــە پیتی عەرەبیی بڵاوکردەوە[١٣] ، کە بە کورتی لـە هەندێ گیروگرفتی بەکار هێنانی ئەلف و بێی عەرەبی بۆ زمانی کوردیی دواوە .

هەر لە بارەی ئیملای کوردییەوە ساڵی ١٩٦٩ کتێبی مامۆستا طاهر صادق لە چاپ درا[١٤]. لەم کتێبـەدا باسی هەندێ کێشەی

---

(١٢) جەمال نەبەز ، نوسینی کوردیی بە لاتینیی ، بەغدا ١٩٥٧ .

(١٣) أ ب هەوری ، نوسینی زمانی کوردیی بە پیتی عەرەبیی ، ســـلیمانیی ١٩٦٨ .

(١٤) طاهر صادق ، چۆنێتی نوسینی کوردیی ، کەرکوك ١٩٦٩ .

نوسینی کوردتی کراوه و له باره‌یانه‌وه نوسه‌ر ڕای خۆی داوه .

مامۆستا جگه‌ر خوێنیش له ساڵی ۱۹۶۱دا له باره‌ی ڕێ‌زمانی کوردییه‌وه کتێبێکی له ژێر ناوی « آوا ئو ده‌ستورا زمانی کوردتی »دا پێشکه‌ش به خوێنده‌وارانی کورد کرد[۱۵] . هه‌روه‌ها مامۆستایان : شێخ محه‌مه‌دی خاڵ و عه‌لائه‌دین سه‌جادی و گیو موکریانی[۱۶] و گه‌لێکی تر له‌م ڕووه‌وه درێغی‌یان نه‌کردوه . مامۆستا حامد فه‌ره‌ج جگه له کتێبی « ئه‌لف و بێی کوردی »[۱۷] که له ساڵانی ۳۰دا بۆ قوتابخانه سه‌ره‌تاییه‌کانی داناوه ، هه‌روه‌ها هه‌ندێ وتاریشی بڵاوکردۆته‌وه .

له‌م چوار ساڵه‌ی دواییدا ـ واته له ڕێکه‌وتنی ئازاری مێژوویی‌یه‌وه له سه‌ر لاپه‌ڕه‌کانی گۆڤار و ڕۆژنامه کوردییه‌کاندا

---

(۱۵) جگر خوین ، آوا ئو ده‌ستورا زمانی کوردتی ، به‌غدا ۱۹۶۱ .

(۱٦) به‌تایبه‌تی له بیشه‌کی فه‌رهه‌نگه‌کانیاندا له ڕێزمانی کوردتی دواون ، به وێنه بڕوانه :

أ ـ شێخ محه‌مه‌دی خاڵ ، فه‌رهه‌نگی خاڵ ، ب ۱ ، سلێمانی ۱۹۶۰ ، ل ۲۷ ـ ۳۹ ؛

ب ـ عه‌لائه‌دین سه‌جادی ، ده‌ستور وه فه‌رهه‌نگی زمانی کوردتی ـ عه‌ره‌بی ـ فارسی ، به‌غدا ۱۹٦۲ ، ل ۱۹ ـ ٤۳ ؛

ج ـ گیو موکریانی « گوڵه‌کزێرینه » ، فه‌رهه‌نگی کوردتی ـ فارسی ـ عه‌ره‌بی ـ فه‌ره‌نسایی ـ ئنگلیزی ، هه‌ولێر ۱۹۵۵ ، ل ۹۱ ـ ۹۷ .

(۱۷) حامد فه‌ره‌ج ، ئه‌لف و بێی کوردتی ، به‌غدا ۱۹۳٦ .

گەلێك وتار دەربارەی زمانی کوردی بڵاوکراونەتەوە ، بە تایبەتی وتارەکانی مامۆستایان : مەسعود محەمەد ، د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، د. نەسرین فەخری ، د. کەمال فوئاد ، د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ ، سادق بەهائەدین ، محەمەد ئەمین هەورامانی ، ع. ع. شەونم ، محەمەد ساڵح سەعید ، وە گەلێکی تر [18].

کاری هەرە گەورەی زمانەوانی ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کورد — مامۆستا مەسعود محەمەد — وتاری « بەکار هێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا »[19] و « سوڕێکی خامە بە دەوری

---

(١٨) بە وێنە :

أ ـ عەبدوڵلا سەراج ، سەرنجێك دەربارەی وشە لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « پەروەردە و زانست » ، ژ ٤ ، بەغدا ١٩٧٣ ، ل ١٢ ـ ١٧ ؛

ب ـ مەلا شوکور ، بەکار هێنانی ئاوازی (یش) بە پێی دەستوری زمانی کوردی ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٤ ، بەغدا ١٩٧٠ ، ل ١٤ ـ ١٥ ؛

ج ـ ڕەئوف ئەحمەد ئالانی ، تۆمارکردنی باوك و کوڕ ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ٩ ، بەغدا ١٩٧٠ ، ل ٣٧ ـ ٣٨ ؛

د ـ مەحموود زامدار ، دەنگ یا تیپ ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٢ ، بەغدا ١٩٧٢ ، ل ٤٠ ـ ٤٤ ؛

هـ ـ بەهزاد ، چاوگی کوێرەوەبو لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٢ ، بەغدا ١٩٧٢ ، ل ٢٣ ـ ٢٥ . . .

(١٩) مەسعود محەمەد ، بەکار هێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ١٩٧٣ ، ل ٣٩ـ١١٤ .

( ڕاناو ) دا »[20] ، کە لە بەرگی یەکەم و دووەمی گۆڤاری کۆڕدا بڵاوکراونەتەوە[21] ؛ لەگەڵ ئەو باسەش کە بە ناوی « گیروگرفتی ڕێنوسی کوردی » یەوە لەو کۆڕەی کە وەزارەتی کاروباری ژوورو و پەروەردەی گشتی خوێندنی کوردی لە ۲٥ و ۲٦ و ۲۷ ی تەموزی ساڵی ۱۹۷۳ دا لە شەقڵاوە بۆ لێکۆڵینەوەی کتێبی قوتابخانە بە زمانی کوردی بەستی پێشکەشی کردووە[22] .

د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی جگە لەو وتارانەی لە هەندێ ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردیدا بڵاوی کردۆتەوە ، لە هەر دوو بەرگی گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » یشدا بەرهەمی خۆی پێشکەش کردوە[23] .

د. نەسرین فەخری بە تایبەتی لە بارەی پێشگر و پاشگرەوە

(۲۰) مەسعود محەممەد ، سوژێکی خامە بە دەوری ( ڕاناو ) دا ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ۲ ، ۱۹۷٤ ، ل ۹ ـ ۱٤۷ .

(۲۱) مامۆستا مەسعود محەممەد بۆ ئەو دوو وتارەی لە سەرەوە ناومان بردن پێشەکییەکی ( ۳۲ ) لاپەڕەیی نوسیوە و بە شێوەی کتێب لە ژێر ناوی « وردبونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی » دا بڵاوی کردۆتەوە .

(۲۲) مەسعود محەممەد ، گیروگرفتی ڕێنوسی کوردی ، گۆڤاری « پەروەردە و زانست » ، ژ ٦ ، ۱۹۷۳ ، ل ۷ ـ ۲۸ .

(۲۳) بڕوانە وتاری : لە کوێوە دەست بکەین بە دەستور سازی ڕێزمانی کوردی ، بەشی یەکەم ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ۱ ، ۱۹۷۳ ، ل ۱۸۰ ـ ۲۱۱ ؛ بەشی دووەم ، هەمان گۆڤار ، ب ۲ ، ۱۹۷٤ ، ل ۳۲٤ ـ ۳٦۲ .

چەند وتارێکی بلاوکردۆتەوە[٢٤] و هەروەها چەند مانگێك لەمەوبەر لە ژێر ناوی « چاوگی بۆ واتا لە زمانی کوردیدا » کتێبێکی ( ١٠٠ ) لاپەڕەیی لە چاپ داوە[٢٥] کە لەو چاوگانە دەدوێ کە بە سادەیی بەکار نایێن و واتا و مەبەستی تەواو نادەن .

لە نیوان ئەو نوسراوانەی د. کەمال فوئاد دەربارەی زمانی کوردی پێشکەشی کردوون ، وتاری « بەراوردێك لە نیوان زمانی نوسینی کوردی رۆژئاوایی ( جەزیری ) و زمانی نوسینی کوردی رۆژهەلاتی ( سلێمانی )دا »[٢٦] و « زاراوەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەدەبی و نوسینیان »[٢٧] و « چەند سەرنجێکی زمانەوانی »[٢٨] دیارن .

د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ جگە لەو لێکۆڵینەوانەی لە بارەی

---

(٢٤) بە وێنە :

أ ـ ناو و پێشگر و پاشگر لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ٥ ، بەغدا ١٩٧٠ ، ل ١٠ ـ ١٧ .

ب ـ پاشگر و پێشگری ( ڤە ) یان ( وە ) لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ١٩٧٣ ، ل ٢٣٤ ـ ٢٧٣ .

(٢٥) د. نەسرین فەخری ، چاوگی بۆ واتا لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ١٩٧٣ .

(٢٦) بڕوانە : گۆڤاری « زانیاری » ، ژ ٥ ، بەغدا ١٩٧٢ ، ل ١٧ـ٢٥.

(٢٧) بڕوانە : گۆڤاری « زانیاری » ، ژ ٤ ، بەغدا ١٩٧١ ، ل ١٦ـ٢٤.

(٢٨) بڕوانە : گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٢ ، بەغدا ١٩٧١ ، ل ٥٨ ـ ٥٩ .

فۆلکلۆر و ئەدەبی کوردییەوە بڵاوی کردۆتەوە ، هەروەها زنجیرەیەك وتاری زمانەوانی[٢٩] و نامیلکەیەکی سەبارەت بە زمانی ئەدەبی یەکگرتوی کوردی[٣٠] نوسیوە . شایانی باسە کە د. عیزەدین مستەفا لە بارەی هەندێ کێشەی زمانی کوردیشەوە هەندی ڕای جوان و واقعی دەربڕیوە و چەند سەرنج و تێبینی بەنرخی نیشان داوە .

مامۆستا صادق بەهائەدین جگە لەو ژمارە وتارەی لە ڕۆژنامەی « هاوکاری »دا لە بارەی زمانی کوردییەوە بڵاوی کردۆتەوە ، چەند وتارێکیشی لە گۆڤارە کوردییەکاندا نوسیوە[٣١] ، وە ماوەی چەند مانگێك لەمەوبەریش بە ناوی « ئیدیەمێت کوردی » یەوە کتێبێکی ( ١٦٠ ) لاپەڕەیی لە چاپ دا[٣٢] .

---

(٢٩) د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ ، زمانەوانی ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٢ ، ١٩٧٠ ، ل ١٠ – ١١ ؛ ژ ٤ ، ١٩٧٠ ، ل ١٣ ؛ ژ ١ ، ١٩٧٢ ، ل ١٤ – ١٥ .

(٣٠) د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ ، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی یەکگرتوی کوردی ، بەغدا ١٩٧١ .

(٣١) بە وێنە :
أ – زمانی کوردی ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ١١ ، ١٩٧١ ، ل ٢١ – ٢٢ ؛
ب – زمانی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٥ – ٦ ، ١٩٧١ ، ل ٤٩ – ٥١ ...

(٣٢) صادق بەهائەدین ، ئیدیەمێت کوردی ، بەغدا ١٩٧٣ .

ماوەیەکە مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی چالاکانە خەریکی لێکۆڵینەوەی فۆنێتیکی کوردییە و لەو بارەیەوە زنجیرەیەك وتار[33] و نامیلکەیەکی[34] لە چاپ داوە. جگە لە فۆنێتیك چەند نووسراوێکیشی لە بابەت هەندێ مەسەلەی تری زمانی کوردییەوە بڵاوکردۆتەوە، وەك: وتاری «زمانەکەمان لە کوێوە هاتوە»[35]....

مامۆستا ع ع. شەونم لە ژێر ناوی «دەستوری زمانی کوردی»دا وتارێکی لە گۆڤاری «برایەتی»دا بڵاوکردەوە[36] و تیایدا لە دەنگەکانی زمانی کوردی و لە جیاوازی نیوان زاناناندا لە

---

(٣٣) بڕوانە :

أ ـ لێکۆڵینەوەی بەراوردی ، ڕۆژنامەی «ڕۆشنبیری نوێ» ، ژ ٠ ، ١٩٧٣ ، ل ٦ ؛

ب ـ جیاوازی نیوان پیت و دەنگ ، ڕۆژنامەی «ڕۆشنبیری نوێ» ، ژ ١ ، ١٩٧٣ ، ل ٢ ؛

ج ـ فۆنێم لە زمانی کوردیدا ، ڕۆژنامەی «ڕۆشنبیری نوێ» ، ژ ٢ ، ١٩٧٢ ، ل ٦ ؛

د ـ دەنگ سازی زمانی کوردی ، ڕۆژنامەی «ڕۆشنبیری نوێ» ، بەشی یەکەم ، ژ ٤ ، ١٩٧٣ ، ل ٦ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٥ ، ١٩٧٤ ، ل ٦ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٧ ، ١٩٧٤ ، ل ١٠ .

(٣٤) محەمەد ئەمین هەورامانی ، فۆنێتیکی زمانی کوردی ، بەغدا ١٩٧٤ .

(٣٥) بڕوانە : گۆڤاری «بەیان» ؛ بەشی یەکەم ، ژ ١٠ ، ١٩٧٣ ، ل ٢١ ـ ٢٣ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١١ ، ١٩٧٣ ، ل ١٥ ـ ١٦ .

(٣٦) بڕوانە : ع. غ شەونم ، دەستوری نوسینی کوردی ، گۆڤاری «برایەتی» ، ژ ٢ ، ١٩٧٠ ، ل ٣٢ ـ ٣٩ .

دیارکردنی دەنگەکاندا دواوە و هەندێ بیر و ڕای دەربڕیوە . لە گۆڤاری « بەیان » یشدا وتاری « زمانی کوردی وێژەی فۆلکلۆرە »ی پێشکەش کردووە[٣٧] .

دەربارەی هەندێ گیروگرفتی زمانی کوردی مامۆستا محەمەد صالح سەعید چەند وتارێکی بڵاوکردۆتەوە ، وەك : « زمانی کوردی و نیشانەکردنی گیروگرفتەکانی »[٣٨] ، « گیروگرفتەکانی زمانی کوردی »[٣٩] ، « جارێکی تریش پیتەکانی کوردی »[٤٠] ...

نوسەری ئەم نامیلکەیەش لەو ژمارە وتارەدا کە لە بارەی کاری فەرهەنگی نوسی کوردییەوە بڵاوی کردۆتەوە لە هەندێ شوێندا لە خاسیەتی وشەی کوردی دواوە ، هەروەها لە گۆڤاری « بەیان »دا لە بابەت فۆنێتیکی کوردییەوە زنجیرەیەك وتاری نوسیوە[٤١] .

لێرەدا ئەوەش دەهێنمەوە یاد کە بەڕێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردی هەندێ کتێبی ڕێزمانی بۆ قوتابخانە کوردییەکان داناوە . لە کۆڕی زانیاری کوردیش گرنگی تەواو بەم کارە دراوە و جگە

---

(٣٧) بڕوانە : گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٤ ، ١٩٧٠ ، ل ١٠ ـ ١٢ .

(٣٨) بڕوانە : گـۆڤاری « برایەتی » ، ژ ٥ ، ١٩٧٠ ، ل ١٧ ـ ١٨ .

(٣٩) بڕوانە : گـۆڤاری « برایەتی » ، ژ ١٠ ، ١٩٧١ ، ل ٢٣ ـ ٢٤ .

(٤٠) بڕوانە : گـۆڤاری « نوسەری کورد » ، ژ ٤ ، ١٩٧١ ، ل ٦٤ ـ ٧٠ .

(٤١) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، گـۆڤاری « بەیان » بەشی یەکەم ، ژ ١٢ ، ١٩٧٤ ، ل ١٤ ، ٢٦ ـ ٢٧ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٣ ، ١٩٧٤ ، ل ٢ ـ ٤ ؛ ...

لەو لێژنە تایبەتیانەی بە لێکۆڵینەوەی مەسەلەی جیاوازی زمانی کوردییەوە خەریکن ، لەم ڕووەوە ژمارەیەك وتار لە بەرگی یەکەم[٤٢] و دووەمی[٤٣] گۆڤاری کۆڕدا بڵاوکراونەتەوە .

(٤٢) بە وێنە بڕوانە :

أ ـ تۆفیق وەهبی ، ئەسڵی پیتە قاڵبی ( ئە ) ی شێوەی سلێمانی ، ل ٩ ـ ٣٨ ؛

ب ـ مەسعود محەمەد ، بەکارهێنانی ( ی ) لە ڕێزمانی کوردیدا ، ل ٣٩ ـ ١١٤ ؛

ج ـ د عەبدوڵلا نەقشبەندی ، پاشکۆی ( درا ) . ل ١١٥ ـ ١٣١ ؛

د ـ د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، لە کوێوە دەست بکەین بە دەستور سازی ڕێزمانی کوردی ، ١٨٠ ـ ٢١٢ ؛

هـ ـ د. نەسرین فەخری ، پاشگر و پێشگری ( ڤە ) یان ( وە ) لە زمانی کوردیدا ، ل ٢٣٤ ـ ٢٧٣ .

(٤٣) بە وێنە بڕوانە :

أ ـ مەسعود محەمەد ، سوڕێکی خامە بە دەوری ( ڕانـاو )دا ل ٩ ـ ١٤٧ ؛

ب ـ عەلائەدین سەجادی ، وشەی کوردی ، ل ١٤٨ ـ ١٧٨ ؛

ج ـ شێخ محەمەدی خاڵ ، پێشگر و پاشگر ، ل ٢٥٦ ـ ٢٧٩ ؛

د ـ هەژار ، کورد و سەربەخۆیی زمان ، ل ٢٨٠ ـ ٣٢٣ ؛

هـ ـ د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی ، لە کوێوە دەست بکەین بە دەستور سازی ڕێزمانی کوردی ، ل ٣٢٤ ـ ٣٦٢ ؛

و ـ جەمال بابان ، هەندێك لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر دەبەخشن ، ل ٥٦٩ ـ ٦٢٣ ؛

ی ـ کامیل بەصیر ، زمانی عەرەبی و کێشەی زاراوەی کوردی ، ل ٧٥١ ـ ٧٦٨ .

بەم جۆرە دەبینین کە لە کوردستان گەلێك وتار و نامیلکە و کتێب لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراون ، بەڵام بەداخەوە ، دەربارەی زمانەکەمان هەندێ کێشەی وەها هەیە کە کەم یا زۆر باسیان نەکراوە و هێشتا بیر و نووکی قەڵەمیان نەگەیشتوونەتێ . هەروەها گەلێ ڕووی ئەم زانستە هەرچەندە باس کراوە ، بەڵام بە تەواوی تیشکی ڕووناکیی بە سەردا نەپڕژاوە ...

## لە یەکێتیی سۆڤێت :

لە بەر چەند هۆیەکی ئاشکرا پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە مەسەلەی کوردناسی گرنگی دراوە ، وە کوردناسی لە ڕووسیای قەیسەری ناوبانگی دەرکردووە ، بەڵام سەرکەوتنی شۆرشی ئۆکتۆبەر بە شێوەیەکی عادیلانە و بە مەبەستێکی پیرۆز کارێکی ئێجگار گەورەی هەبوو بۆ ئەو چەند هەزار کوردە ، کە یەکێك بوون لە کەمینە نەتەوایەتی و هەرە دواکەوتووەکانی ڕووسیای قەیسەری . بێشك ئەنجامی ئەو سیاسەتە ڕاستە بوو کە میللەتێکی نەخوێندەوار و پاشکەوتوو بگەیەنێتە ئەم ڕادەیەی ئەمڕۆی کە لە هەموو کار و زانستێکدا خاوەنی دەها پسپۆر و شارەزایان بێت و لە هەموو بارێکی ژیاندا سەربەستیی تەواوی هەبێت .

بایەخ دان بە کوردناسی دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ئەوندەی تر پەرەی سەند و بوونی کەمینەیەکی کورد لەم وڵاتەدا و ئەو گۆڕانە هەرە گەورەیەی بەســـەر ژیانی نوێیدا هات بوونە هۆیەکی گرنگ و نوێی گەشەکردن و پێشکەوتنی کوردناسی سـۆڤێت و یەکێك لە ئەنجامە هەرە گرنگەکانی ئەوە بوو کە پاش ماوەیەك رۆڵـەکانی ئـەم کەمینەیە خۆشیان چاکیان لێ کرد بە لادا و چالاکانە هاتنە گۆڕەوە... ئێـستا چوار مەڵبەندی کوردناسی لە سۆڤێت هەیە : لە یەریڤان و لێنینگراد و مۆسکۆ و باکۆ[44] .

هەر لە دانانی ئەلف و بێی کوردی لە ســـاڵی ١٩٢٨دا و کردنەوەی قوتابخانەی کوردی بە تایبەتی لە ئەرمەنــــتانی سۆڤێت هەست بە پێشکەوتنی کاری کوردناسی دەکرێت. لە ســـالآنی ٣٠دا بۆ کۆکردنەوەی کەرەستەی زمانەوانی و ئەتنۆگرافی و فۆلـکلۆری چەند لیژنەیەکیان بۆ دێهاتە کوردییەکان نارد. دوو زانای بەناوبانگ : ئەمینی عەودال و حاجی جندی لە کاروباری ئەو لیژنانەدا هاوبەشـییان کردووە. هەروەها کۆنفرانسی کوردناسی ، کە لە ســاڵی ١٩٣٤ لە یەریڤان بەســـترا بایەخێکی ئێجگار گەورەی هەبوو لە پێشخســـتنی کوردناسی سۆڤێتدا[45] .

---

(٤٤) کاروباری زانـستی ئەم چوار مەڵبەندە بە تەواوی پێکەوە بەســـتراون و هەنگاوی هەر مەڵبەندێکیان بە بەشـداری و هاوکاری ئەوانی تر دەنرێن .

(٤٥) لەم کۆنفرانسەدا لە گەلێك وتاری زانستی کۆڵیونەتەوە ، بەتایبەتی لە وتاری : حاجی جندی « رێگای پێشــکەوتنی زمانی ئـەدەبی کوردی سـۆڤێت » ؛ ئەمینی عەودال « رێنووســی زمانی کوردی » ، قەناتی=

سالی ۱۹۲۸ کۆمیتەی ناوەندیِ پارتی کۆمۆنیستی ئەرمەنستان ژمارەیەك قوتابی کوردیّ نارد بۆ « زانستگەی کرێکاران » لە لینینگراد . پاش تەواوکردنی زانستگە هەندێکیان گەڕانەوە بۆ ئەرمەنستان و چەند کەسێکیان لە ئامۆژگای زمانەوانیّ زانکۆی لینیگراد وەرگیران . بەم بۆنەیەوە سەرۆکی بەشی ئێرانیّ پرۆفیسۆر ئا. ئا. فرێیمەن بەشی کوردیّ کردەوە ، وە بۆ پتەو بوّن و فراوان کردنی بەشەکە چەند قوتابیەکی لە میللەتانی تری سۆڤێت وەرگرت و هەروەها ئی. ئا. ئۆربیلی بۆ وتنەوەی زمانی کوردیّ و ئەتنۆگرافیای کورد بانگ کرد .

سالی ۱۹۳۳ چەند قوتابیەکی پۆلی سێیەم : قەناتی کوردۆ و عەرەبی شەمۆ و ئیسحاق تسوکەرمان بە ڕابەری مامۆستاکانیان لە بارەی زمانی کوردییەوە دوّ وتاریان بڵاوکردەوە : « ئێزافە لە زمانی کوردیدا »[٤٦] و « نێر و مێ لە زمانی کوردیدا »[٤٧] . لەم دوّ وتارەدا بۆ یەکەم جار لە مێژوّی کوردناسیدا هەست بە هەندێ خاسیەتی دابەشکردنی ناو بەسەر نێر و مێدا و نیشانەی ئێزافە کراوە . پێگەیاندنی کادری کوردناسیّ لە بەشی ئەدابی زانکۆی

= کوردۆ « بنچینەی ڕێزمانی زمانی کوردیّ » ؛ عەرەبی شەمۆ « کێشەی دەربەگایەتیّ لای کوردی پشت قەفقاس » . .. هتد .

(٤٦) بڕوانە : گۆڤاری « شۆڕش و نوسین » ، مۆسکۆ ۱۹۳۳ ، ژ ۱ ، ل ٥١ ــ ٥٦ .

(٤٧) بڕوانە : کتێبی « نوسین و شۆڕش » ، مۆسکۆ ۱۹۳۳ ، ژ ۱ ، ل ۱۷۹ ــ ۱۸۰ .

لێنینگراد بە تایبەتی بە یارمەتی ئا. ئا. فریمەن و ئی. ئا. ئۆربێلی هەنگاوێکی گەورە بۆ لە پێشخستنی کوردناسیدا بە گشتی و وەرگرتنی شێوەیەکی ڕاست و شێوازێکی زانستی لە لێکۆڵینەوەی مەسەلەی کوردناسیدا .

لە نێوان ئەو لێکۆڵینەوانەی سەبارەت بە زمانی کوردی لە یەکێتی سۆڤێت نوسراون ، کاری ئەم زانایانە : حاجی جندی ، ئا . خاچاتۆریان ، ق. کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، ئی. ئی. تسوکەرمان ، چ. بەکۆ ( باکاییف ) ، یو . یو . ئاڤالیانی . . . بەناوبانگن .

لە ساڵی ١٩٣٢ دا ئا . خاچاتۆریان کتێبێکی ڕێزمانی کوردی بە ئەرمەنی و کوردی لە چاپ دا[٤٨] . ناتەواوی گەورەی ئەم کتێبە ئەوەیە کە دەستوری زمانی ئەرمەنی بەسەر زمانی کوردیدا سەپاندووە . هەروەها نوسەر لەسەر بناغەی نوسراوەکانی ( جاردین و یوستی و بییدار . . . هتد ) ئەم ڕێزمانەی نوسیوە ، بێ ئەوەی سود لە زمانی گفتوگۆی کوردی وەربگرێ ، ئەمەش بووە بە هۆی سەرنەکەوتنی کارەکەی .

لە ساڵی ١٩٢٥ لە یەریڤان ئا . خاچاتۆریان و حاجی جندی بۆ قوتابخانە ناوەندییەکان کتێبێکی ڕێزمانی کوردییان دانا[٤٩] .

---

(٤٨) ئا . خاچاتۆریان ، زمانئامەی کرمانجی ، یەریڤان ١٩٣٢ ( بە زمانی کوردی و ئەرمەنی ) .

(٤٩) ئا . خاچاتۆریان و حاجی جندی ، زمانئامە ژا کرمانجی ، یەریڤان ١٩٢٥ ( بە زمانی کوردی ) .

ئەم کتێبە ، هەر وەك ئەوەی پێشوو ناتەواوی ئێجگار زۆر بوو ، وە زۆر لەو کەم و کورتیانەی لە کتێبی ڕێزمانی توسەرانی زۆردا هەبوون دوبارە کراونەتەوە . لەگەڵ هەموو ئەو کەم و کورتیانەشدا ، ڕێزمانەکەی ئا. خاچاتۆریان و حاجی جندی « دەورێکی گەورەی بینیوە لە پێشکەوتنی ڕۆشنبیری کوردی ئەرمەنستاندا »[50] . هەروەها نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە « دانەرانی ئەم ڕێزمانە لە چۆنێتی داڕشتنی بنچینەی ڕێزمانی زمانی کوردیدا بۆ قوتابخانە کوردیەکان هیچ ڕێزەوێکی پێشوو لەبەر دەستیاندا نەبووە تا سوودی لێ وەربگرن »[51] .

لە مەیدانی کوردناسیدا بەگشتی و لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا بە تایبەتی ، مامۆستا قەناتی کوردۆ خزمەتێکی گەورە و شایانی کردوە و گەلێك وتار و نامیلکە و کتێبی دەربارەی زمانی کوردی ـ واتە نووسینی ڕێزمانی کوردی (تیۆری و پراکتیك) ، لێکۆڵینەوە لە زمانی گفتوگۆ و لە زمانی ئەدەبی ، بەراوردکردنی دیالێکتی کرمانجی ژووری و خواروو ، دانانی فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی و ئەو بابەتانە .

ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر پێویستە سەرنجی بۆ ڕابکێشرێت ئەوەیە کە وا مامۆستا قەناتی کوردۆ ساڵی ١٩٤٩ کتێبێکی ڕێزمانی

---

(٥٠) ئی . ئی . تسوکرمان ، ڕێزمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ١٩٦٢ ، ل ١٥ .

(٥١) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥ .

کوردیی لە چاپ دا[52] و ساڵی ١٩٥٧یش بە زمانی ڕووسی کتێبێکی تری هەر لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە بڵاوکردەوە[53]. گرنگی ئەم دوو کتێبی ڕێزمانە تەنها لەوەدا نییە کە بۆ یەکەم جار لە سۆڤیێت و لە مێژووی کوردناسیدا لە سەر شێوەیەکی زانستی کتێب دەربارەی زمانی کوردیی بڵاوبکرێتەوە، بەڵکو سەرەڕای ئەوەش توانرا لەم دوو کتێبەدا گەلێك کاری ئاڵۆز و ناڕوونی ئاشکرا لە ڕێگایەکی زانستییەوە خاوبکرێتەوە و ئاشکرا بکرێ، وەك: دۆزینەوەی نێر و مێ و دابەشکردنی ناو بە سەریاندا؛ خاوکردنەوەی هەندێ ئاڵۆزی لە ڕەگی کردار و لە پێشگر و پاشگردا؛ شێوەی کرداری (متعدی transitive) لە کاتی ڕابوردوودا؛ هەروەها گەلێك مەسەلەی گرنگی تر کە تا دەرچوونی ئەم دوو بەرهەمەی مامۆستا کوردۆ باش لێیان نەکۆڵرابۆوە.

هەرچەندە ئەو دوو کتێبی ڕێزمانە کە لە سەر شێوەیەکی زانستی و کەرەستەیەکی فراوان نووسراون و کەم و کورتییان زۆر کەمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر جارێك کە لە چاپ دەدرێنەوە دانەرەکەیان گەلێك فراوانتریان دەکات و بە شێوەیەکی جوانتر و ڕاستتر دایان دەڕێژێتەوە، لەبەر ئەوە چاپی یەکەی «ڕێزمانی زمانی کوردیی»، کە لە ساڵی ١٩٤٩دا دەرچووە گەلێك جیاوازی لەگەڵ

(٥٢) ق. کوردۆ، ڕێزمانی زمانی کوردیی، (بە زمانی کوردیی)، چاپی یەکەم، یەریڤان ١٩٤٩.

(٥٣) ق. کوردۆ، ڕێزمانی زمانی کوردیی، (بە زمانی ڕووسی)، مۆسکۆ ١٩٥٧.

چاپی چوارەمیدا هەیە[٥٤]. ئەو چوار چاپەی ئەو کتێبە کە بە زمانی کوردی دەرچوون دەورێکی گەورەیان لە ناو قوتابخانە کوردییەکانی ئەرمەنستانی سۆڤیێتدا بینیوە. مامۆستایانی زمانی کوردی ئەو قوتابخانانە زۆر بایەخیان داوە بە کتێبەکانی ق. کوردۆ، بەتایبەتی چونکە بە شێوەیەکی ئاسان و رەوان نوسراون.

هەرچەندە زوربەی لێکۆڵینەوەکانی ناوەرۆکی ئەو کتێبانەی ق کوردۆ دەربارەی (فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی و سینتکسیس)ن، کە گرنگترین بەشن لە لێکۆڵینەوەی زماندا، بەلام لە هەمان کاتدا مامۆستا لە چۆنیێتی دروست بون و دارشتنی وشە «اشتقاق، تکوین الکلمات Word - Building »یشەوە گەلێك وتاری نوسیوە، وەك: «دروست بونی کرداری بارگران لە زمانی کوردیدا»[٥٥]؛ «دروست بونی وشە لە زمانی کوردیدا»[٥٦]؛ «مانا و فرمانی پاشگری ـ ك ـ (ەکە) لە زمانی کوردیدا»[٥٧]، «پێشگر و پاشگر لە زمانی

(٥٤) کتێبی «رێزمانی زمانی کوردی»، کە بە زمانی کوردی نوسراوە و لە ساڵی ١٩٤٩دا لە یەریڤان لە چاپ دراوە، تاکو ئێستا چوار جار ـ واتە لە ساڵانی ١٩٤٩ و ١٩٥٦ و ١٩٦٠ و ١٩٧٠دا لە چاپ دراوەتەوە.

(٥٥) کورتەی نامەی دوکتۆری مامۆستا کوردۆ، لێنینگراد ١٩٤١.

(٥٦) بڕوانە کتێبی «رێزمان و مێژوی زمانەکانی رۆژهەلات»، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ١٩٥٨، ل ١٠٩ ـ ١٤٢.

(٥٧) بڕوانە کتێبی «لێکۆڵینەوە لە مێژوی کولتوری گەلانی رۆژهەلات»، بۆ بیرەوەری ئەکادیمی ئی. ئا. ئۆربیلی، مۆسکۆ ـ لینینگراد ١٩٦٠، ل ٣٦١ ـ ٣٦٨.

کوردیدا »[٥٨] .... هتد . لەم وتارانەدا هەمو ئەو ڕێگایانە دیارکراون کە لە زمانی کوردیدا وشەیان پێ دروست دەکرێت . ناوەرۆکی ئەم وتارانە بە شێوەیەکی کورت و پێویست لە چاپی چوارەمی کتێبی « ڕێزمانی زمانی کوردی »دا بڵاوکراونەتەوە .

پاش ئـەوەی ق. کوردۆ دەربارەی ڕێزمانی زمانی کوردی گەلێك وتار و نامیلـکە و کتێبی بڵاوکردەوە ، ئنجا لە سـاڵانی پەنجادا دەستی کرد بە دانانی فەرهەنگێـکی کوردی ( دیالێکتی کرمانجی ژوورو ) ـ ڕوسی و ساڵی ١٩٦٠ ئەم فەرهەنـگە کە بەرهەمی ڕەنجی چەند سـاڵەی بو لە چاپ درا[٥٩] . ژمارەی وشە کوردییەکانی ئەم فەرهەنگە ( ٣٤ ) هەزار وشەیەکە کە لە وەرگێڕان و لێـکدانەوەیاندا کوردۆ هونەرێـکی بەرزی نواندوە . بە زمانێـکی ڕەوان و پاراو ، بە وشەی پڕ بە پێستی خۆی شەرحی وشـەکانی کردوە . هەروەها پێویستە سـەرنج بۆ ئەوەش ڕابکێشین کە وا لە پەنجا و حەوت لاپەڕەی کۆتایی فەرهەنـگەکەیـدا بە کورتی لە ڕێزمانی زمانی کوردی دواوە .

ق. کوردۆ تا ساڵی ١٩٥٠ تەنها بە لێـکۆڵینەوەی دیالێـکتی کرمانجی ژوورووەوە خەریك بـو ، بەڵام لە پاش سـاڵی ١٩٥٠وە کەوتە فێربـونـ و لێـکۆڵینەوەی دیالێـکتی کرمانجی خوارو‌ش و ئەمەش زیاتر یارمەتی دا کە بتـوانێ قوڵتر لە زمانی کوردی

(٥٨) بڕوانە کتێبی « کورتەی دەنگوباسـی ئامۆزگای گەلانی ئاسـیا » ، ١٩٦٣ ، ژ ٩٧ ، ل ٣٢ ـ ٣٣ .

(٥٩) ق کوردۆ ، فەرهەنـگی کوردی ـ ڕوسی ، مۆسکۆ ١٩٦٠ .

بکۆڵیتەوە . ئەوە بۆ لە ماوەیەکی کورتدا توانی گەلێك لێکۆڵینەوە دەربارەی بەراوردکردنی رێزمانی هەردوو دیالێکتی کوردی (کرمانجی ژوورو و خوارو) بڵاوبکاتەوە ، وەك : « دەربارەی رێزمانی زمانی کوردی »[٦٠] ؛ « تصریفی کرداری (متعدی transitive) لە زمانی کوردیدا » (لەبەر رۆشنایی لێکۆڵینەوەی دیالێکتی کرمانجی ژوورو و خوارو)[٦١] ؛ « جێناوی لکاو (enclitic) لە زمانی کوردیدا »[٦٢]... وە لە ساڵی ١٩٦٥ دا کتێبێکی لە چاپ دا لە ژێر ناوی « بەراوردکردنی رێزمانی دیالێکتەکانی کوردی » (کرمانجی ژوورو و خوارو)[٦٣] کە بریتییە لە نامەی دوکتۆرێکەی کە دەتوانرێ بە یەکەمین لێکۆڵینەوە لە مەسەلەی بەراوردکردنی دیالێکتەکانی کوردی دابنرێت ، ئەویش نەك تەنها لەبەر ئەوەی لەم رووەوە لێکۆڵینەوە زۆر کەمە ، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە تاکو ئێستا هیچ کوردناسێکی تر نەیتوانیوە بەو شێوە زانستییە لەو باسە گرگە

---

(٦٠) ق. کوردۆ ، دەربارەی رێزمانی زمانی کوردی ، (بە زمانی رووسی) ، مۆسکۆ ١٩٦٠ .

(٦١) بڕوانە کتێبی « وتاری نوێنەرانی سۆڤیێت لە کۆنگرەی بیست و چوارەمی رۆژهەڵاتناسیدا » ، مۆسکۆ ١٩٦٠ ، ل ٩ .

(٦٢) بڕوانە کتێبی « نوسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژووی کولتوری گەلانی رۆژهەڵات » ، لینینگراد ١٩٦٥ ، ل ٥٦ ـ ٥٧ .

(٦٣) ق. کوردۆ ، بەراوردکردنی رێزمانی دیالێکتەکانی کوردی ، (کرمانجی ژوورو و خوارو) ، مۆسکۆ ١٩٦٥ ، ل ٨١ ( کورتەی نامەی دوکتۆری ) .

کۆڵینەوە و ئەوەندە کەرەستە بە شێوەیەکی وا ڕاست و گونجاو بەکار بهێنێ .

مەبەستە هەرە گرنگەکانی ئەم بەرهەمە زانستییەی کوردۆ بریتین لە دەرخستنی یەکێتی و وێکچوونی دیالێکتەکانی زمانی کوردی و دیارکردنی هۆ مێژوویییەکانی ئەو جیاوازییە کەمانەی لە نێوانیاندا هەن لەگەڵ نیشاندانی ڕادەی دەوڵەمەندی و پێشکەوتنی ئەم زمانە .

وەك وتمان ئەم کتێبە کورتەی نامەی دوکتۆرێکەیەتی ، وە هەر لەبەر ئەوەشە کە گشت سوچێکی زمانی کوردی نەگرتۆتەوە ، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٨دا لە نوسینی نامەی دوکتۆرێکەی بوەوە و شەهادەی دوکتۆری علومی وەرگرت . نامەی دوکتۆرێکەی نزیکەی (٦٠٠) لاپەڕە دەبێ و ئێستا لە ژێر چاپدایە . بێگومان وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە زانستییە گرنگە بۆ سەر زمانی کوردی کارێکی پێویستە ، چونکە لەو باوەڕەداین یارمەتی شارەزایانی کورد بدات بۆ چارەسەر کردنی گەلێك لەو گیر و گرفتانەی لە ڕێگای زمانەکەماندا هەن .

قەناتی کوردۆ تەنها بە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردییەوە خەریك نەبوە ، بەڵکو گەلێك بەرهەمی زانستیشی لە بارەی ئەدەب و فۆلکلۆر و مێژووی کوردەوە بڵاوکردۆتەوە ، کە بەداخەوە لێرەدا توانای ئەوە نییە لە هەمووی بدوێین[٦٤] .

---

(٦٤) بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو سەبارەت بە کارە زانستییەکانی قەناتی کوردۆ ، بڕوانە : ئەو زنجیرە وتارەی کە نوسەری ئەم نامیلکەیە لە=

هەروەها ئی. ئی. تسوکەرمان کە لە بەشی کوردیی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی لێنینگرادە ، خزمەتێکی باشی زمانی کوردیی کردوە و ژمارەیەکی زۆر لە وتار و نامیلکە و کتێبی لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسیوە . ئەوەی لە ناویاندا جێگای بەرز و دیاری وەرگرتبێ « ڕێزمانی زمانی کوردیی »یە کە لە ساڵی ١٩٦٢دا لە چاپ دراوە[٦٥]. ئەم نووسراوەی کە بریتییە لە (٢٤٠) لاپەڕە ، دەربارەی کردارە لە دیالێکتی کرمانجی ژوورودا . بەمە و گەلێک کاری زانستی تر لە مەسەلەی مۆرفۆلۆژیادا[٦٦] گەلێک کێشەی ئاڵۆز و گرنگی ڕێزمانی زمانی کوردیی خاوکردۆتەوە .

چەرکەزی بەکۆ (باکاییف) کە کوردی سۆڤیێتە لە ئامۆژگای زمانەوانی مۆسکۆ کار دەکات . ئەم زانایەش خاوەنی گەلێک وتار و نامیلکە و کتێبە . زۆربەی نووسینەکانی سەبارەت بە بەشە دیالێکتی کوردی سۆڤیێتە . لە کارە زانستیێکانیدا ، بە تایبەتی فەرهەنگی

---

ژمارە ٤٦ و ٤٧ و ٤٨ ی ساڵی ١٩٧٣ ی ڕۆژنامەی « برایەتی » دا لە ژێر ناوی « کوردۆ ـ کورد و کوردپەروەر و کوردناس » دا بڵاوی کردۆتەوە .

(٦٥) ئی. ئی. تسوکەرمان ، ڕێزمانی زمانی کوردیی ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

(٦٦) بە وێنە : « وشەی مرکب لە زمانی کوردیدا » ( لە کتێبی : وتاری زانایانی ئامۆژگای زمانەوانی ، لێنینگراد ١٩٦٣ ) ؛ « نیشانەی کۆ لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا » ( فیلۆلۆژیای ئێرانی ، مۆسکۆ ١٩٦٩ ) ...

« کوردی ـ ڕۆسی »[٦٧] و کتێبی « زمانی کوردەکانی ئازربایجان »[٦٨] دیارن .

شایانی باسە باکاییڤ خاوەنی یەکەم فەرهەنگی کوردی ـ ڕۆسییە کە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر چاپ کراوە . ئەم فەرهەنگە بریتییە لە ( ١٤ ) هەزار وشەی کوردی و ( ٦١٨ ) لاپەڕە . لە پاشکۆی ئەم نوسـراوەدا ( ل ٥٠٩ ـ ٦١٨ ) کورتەیەکی ڕێزمانی کوردی داوە . هەرچەندە لەم کارەدا گەلێک ناتەواوی هەیە ، وەك شێواندنی بەشە کوردییەکەی بە وشەی ڕۆسی کە بە هیچ جۆرێك لە زمانی کوردیدا بەکار ناهێنرێن ، یاخود کەم و کورتی لە شـەرح و لێکدانەوەی مانای هەندێ وشەدا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جێگەیەکی دیاری لە کوردناسی سۆڤێتدا هەیە .

کتێبی « زمانی کوردەکانی ئازربایجان »ەکەی بریتییە لە ( ٢٨٤ ) لاپەڕە . بە شێوازێکی زانستی و فراوان لە فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی و سینتکیس کۆڵیوەتەوە . نوسەر لەم کتێبەدا سەرکەوتووە و هەندێ مەسەلەی زمانەوانی خاوکردۆتەوە و ئەنجامی بەکەڵکی داوە .

هەروەها چەند مانگێك لەمەوبەر باکاییڤ لە ژێر نـاوی « زمانی کوردەکانی سـۆڤێتدا » کتێبێکی بەنرخ و ڕازاوەی بڵاوکردەوە[٦٩] باکاییڤ لەم نوسـراوەدا لە ئەنجامی بەراوردکردنی

(٦٧) چ خ باکاییڤ ، فەرهەنگی کوردی ـ ڕۆسی ، مۆسکۆ ١٩٥٧ .

(٦٨) ج. خ. باکاییڤ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ١٩٧٣ .

(٦٩) ج. خ. باکاییڤ ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ١٩٧٣ .

بەشە دیالێکتەکانی کوردەکانی سۆڤێتدا گەلێك شتی نوێی لە زێزمانی کوردیدا دۆزیوەتەوە .

یو. یو. ئاڤالیانی کە زۆر کەس هێشتا ناوی نەبیستوە خزمەتێکی زۆری زمانی کوردی کردووە . ئەم ئافرەتە لە کۆتایی سالانی ۳۰دا لەگەڵ ق. کوردۆ و ئی. ئی. تسوکەرماندا شاگردی ئا. ئا. فرێیمەن بووە و لە ساڵی ۱۹٤۰دا بڕوانامەی دوکتۆرای وەرگرتووە و نامەکەی لەسەر « جێناو لە زمانی کوردیدا » بووە . ئەم زانایە ئێستا پرۆفیسۆری زانکۆی سەمەرقەندە . کارە زانستییەکانی ( وتار و نامیلکە ) کە دەربارەی زمانی کوردی نوسیویێتی ژمارەیان دەگاتە ( ۱۵ ) ، وە لێکۆڵینەوەکانی شێوازێکی زانستی و واقعی تەواویان هەیە :

جگە لە مامۆستایان ( ئا. خاچاتۆریان ، حاجی جندی ، ق. کوردۆ ، ئی. ئی. تسوکەرمان ، چ خ باکایێف ، یو. یو. ئاڤالیانی ) ، هەروەها مامۆستایان ( کەریمی ئەیوبی ، ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، زاری یوسوپۆڤا ، مەکسیمی خامۆ ... ش ) گەلێك وتار و کتێبی زانستی بەنرخیان لە بارەی زمانی کوردییەوە بلاوکردۆتەوە .

کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا جگە لە چەند وتارێکی بەنرخ ، خاوەنی کتێبی « دیالێکتی کوردی موکری »ن (۷۰) ، کە

(۷۰) ك. ر. ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ۱۹٦۸ .

دەنگێکی باشی لە کوردناسی سۆڤێتدا داوەتەوە ، بە تایبەتی چونکە نوسەرانی ئەم کتێبە بە شێوەیەکی زانستی و ڕاست لە زێزمانی کوردی کۆڵیونەتەوە و بە بیری من ئەم کتێبە پێویستە بکۆڕێتە سەر زمانی کوردی .

مەکسیمی خامۆ کە لە بەشی کوردی زانکۆی یەریڤانە لە بارەی زمانی کوردییەوە چەند وتار و نامیلکەی بڵاوکردۆتەوە ، وەك : « ڕەخنە لە کتێبەکەی چ. خ. باکاییف (شێوەی کوردی تورکمەنستان) »[71] ، « مۆرفۆلۆژی شێوەی بادینان »[72] .... (زارێ یوسوپۆڤا)ش کە لە بەشی کوردی ئامۆزگای ڕۆژهەڵاتناسی لێنینگرادە لەم ڕووەوە درێغی نەکردوە و بەرهەمی زانستی خۆی بڵاوکردۆتەوە .

بەر لەوەی کۆتایی بەم بەشەی باسەکەم بهێنم حەزدەکەم سەرنجیش بۆ ئەوە ڕابکێشم کە وا لە لێکۆڵینەوەی کورد و زمانی کوردیدا ئەکادیمی ئی. ئا. ئۆربیلی دەورێکی تایبەتی هەیە . ئەم زانایە لە یەکێتی سۆڤێت بناغەی کوردناسی دانا و بە فەرمانی ئەو بەشی کوردی ئامۆزگای ڕۆژهەڵاتناسی لێنینگراد کرایەوە . لەگەڵ ئەوەی ئۆربیلی بەگشتی زۆر بە کاروباری کارگێڕی و مەسەلەی زمانەوانییەوە خەریك بوە ، بەڵام جار و بار لە زمانی کوردی کۆڵیوەتەوە و لە ناو دەستنوسەکانیدا هەندێ لێکۆڵینەوەی لە سەر

(٧١) بڕوانە : گۆڤاری « مێژو و فیلۆلۆژی » ، یەریڤان ١٩٦٥ ، ژ ٣ .

(٧٢) بڕوانە : «کورتەی نامەی دوکتۆری » یەریڤان ١٩٦٥ .

زمانی کوردی ئەرمەنستان هەیە . هەروەها خاوەنی فەرهەنگێکی کوردی — ڕۆسی یە کە بەداخەوە مەرگ نەیهێشت بە چاپی بگەیەنێ . ئێستا ئەم فەرهەنگە لە ژێر چاودێری کارگێڕانی بەشی کوردی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی لێنینگرادا ئامادە کراوە و نێرراوە بۆ چاپ .

## لە ئەوروپا :

(ل. و. فۆسسوم)ی میسیۆنێری ئەمەریکی ساڵی ۱۹۱۹ لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە کتێبێکی بڵاوکردەوە[۷۳]. نوسەر ئەم کتێبەی لەسەر بەشە دیالێکتی موکری داناوە و بە تایبەتی لە مۆرفۆلۆژی دواوە ، بەڵام بەداخەوە لە لێکۆڵینەوەکەیدا گرنگی بە خاسیەتی ناوخۆی زمانی کوردی نەداوە و هاتوە دەستوری زمانی ئنگلیزی بەکار هێناوە و ئەمەش بوە بە هۆی ناتەواوی و کەم و کورتی .

ساڵی ۱۹۲۲ ر. ف. جاردین لە بەغدا ، بە زمانی ئنگلیزی کتێبێکی لەسەر ڕێزمانی کوردی بڵاوکردەوە[۷٤] . کەرەستەی ئەم

---

(۷۳) L. O. Fossum, Practical Kurdish Grammar, Minneapolis, 1919.

(۷٤) R. F. Jardine, Bahdinan Kurmanji, Baghdad, 1922.

کتێبە زاری کرمانجی ناوچەی بادینانە و بریتییە لە : مۆرفۆلۆژی (ل ٢ ـ ٤١) ، سینتکسیس (ل ٤١ ـ ٤٤) ، وشە دارشتن (ل ٤٤ـ ٥٢) ، فەرهەنگۆکێکی کوردی ـ ئنگلیزی (ل ٥٥ ـ ١١٤) .

جاردین هەرچەندە لە هەمو لایەکی باسەکە نەکۆڵیوەتەوە و زۆر شتی هەر بە کورتی بڕیوەتەوە ، بەلام کتێبەکەی بە یەکێك لەو کارە هەرە سەرکەوتوانە دادەنرێت کە لە بارەی زێـزمانی کوردییەوە دانرابێت و کەرەستەکەی زاری کرمانجی ناوچەی موسـڵ بێـت . جاردین بە شێوەیەکی زانستانە و ورد بۆ گەلێك لە کێشە گەورەکانی زێزمانی کوردی چوە ، بەلام بە داخەوە لە هەندێـکی تریاندا بـە هەڵەدا چوە .

لە ساڵی ١٩٢٦دا لە پاریس پاول بیدار دەربارەی شـێوەی موسـڵ کتێبێکی بچـوکی زێزمانی زمانی کوردی بڵاوکردەوە[٧٥] . لە لێکۆڵینەوەی زێزماندا نمونەی لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردییەوە هێناوەتەوە . بەشێـکی تایبەتی لە کـتێبەکەی بۆ هەندێ وێکچون و نزیکی وشە و دەستوری زمانی کوردی ـ فەرەنسـی تەرخان کردوە . سەبارەت بە جوانی و دەوڵەمەنـدی زمانی کوردی نوسیویتی : « زمانی کوردی یەکێکە لە زمانە هەرە شـیرینەکان . زمانێکی خـۆش و بە ئاواز و ڕەوان و دەوڵەمەند و فراوانە ، فێربونی ئاسانە . ئەم زمانە سەرنج و دڵ ڕادەکێشێ ... »[٧٦] .

---

(٧٥) P. Beidar , Grammaire Kurde , Paris , 1926 .

(٧٦) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٢٧ .

له پاش دەرچوونی ڕێزمانەکەی پاول بیـدار له کوردناسـتی ئەوروپادا بۆ ماوەیەك هەست بە سستی و بێ بەرهەمی دەکرێت و تا ئەم ساڵانەی دوایی لەم بارەیەوە هیچ شتێـکی وەها بڵاونەکراوەتەوە کـە شایانی باس بێت . ئەوەی کـە لە ماوەی ئـەم ١٥ سـاڵەی دوایشدا هاتبێتە کایەوە ، تەنها نوسراوەکانی ( ئەرنـست مەکاریۆس و د. ن. ماکەنزی ) ن.

له سـاڵی ١٩٥٨دا له شـاری نیویۆرك ئەرنست مەکاریۆس کتێبێکی ڕێزمانی کوردی ( شێوەی سلیمانی ) له چاپ دا[٧٧]. ئەم کتێبـه بریتی‌یە لـە : پێشـەکی — کە دەربارەی زمانی کوردی و لێکۆڵینەوەی دواوە ( ل ٣ ـ ٥ ) ؛ کورتەیەك دەربارەی نوسـینی کوردی بـە پیتی عەرەبی ( ل ٦ ـ ١٢ ) ؛ فۆنێتیك ( ل ١٣ ـ ١٤ ) ، مۆرفۆلۆژی ( ل ١٥ ـ ٨٢ ) ؛ وشـه دارشـتن ( ل ٨٢ ـ ٩١ ) ، سینتکـیس (ل ٩٢ ـ ١٠٦) . لە پاشکۆی کتێبەکەیدا (ل ١٠٩ ـ ١٢٠) ناوی ئـەو سـەرچاوانەی تۆمار کردوە کە دەربارەی زمانی کوردی هەن ، وە لە (ل ١٢٧ ـ ١٣٨ )دا فەرهەنگۆکێکی کوردی ـ ئنگلیزی بڵاوکردۆتەوە .

ساڵی ١٩٦١یش د. ن ماکەنزی کتێبێـکی لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە بڵاوکردەوە[٧٨] ، کە بریتی‌یە لە دوو بەشـی سەربەخۆ .

---

(٧٧) Ernest N. Mccarus, A. Kurdish Grammar, New york, 1958.

(٧٨) D. N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1961.

بەشی یەکەم ـ دەربارەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجی خوارۆن ، بەشی دوەم ـ بەشـــە دیالێکتەکانی کرمانجی ژورۆن . نوســـەر لە لێکۆڵینەرەی بەشـــە دیالێکتەکانی کرمانجی خوارۆدا هەر بەشـــە دیالێکتێکی نـاو ناوە دیالێکت و ناوەکەشـــی بە زاراوی جوگرافی ناوە ، وەك : سلێمانی ، وارماوە ، بنگرد ، پشـدەر ، موکری ، هەولێر ، رەواندوز ، خۆشناو . بە نیسبەت کرمانجی ژورۆشـــەوە عەینی شـــی کردووە : سورچی ، ئاکری ، ئامێدی ، بامەرنی ، زاخۆ ، شێخان . لە لێکۆڵینەوەی دیالێکتی کرمانجی خوارۆدا بە زۆری شێوەی سـلێمانی ، وە بۆ کرمانجی ژورۆ شێوەی ئاکرێـی بەکار هێناوە .

بەشی لێکۆڵینەوە لە هـەر دیالێکتێك دابەش دەکات بە سەر دو فەسڵدا — فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی . لە فەسڵی فۆنێتیکی دیالێکتی کرمانجی خوارۆدا لە شێوەی سلێمانی کۆڵیوەتەوە ، وە بۆ بەشـە دیالێـکتەکانی تر تەنها باسی ئەو جیاوازییانەی کردوە کە لەگەڵ بەشە دیالێـکتی سلێمانیـدا هەیانە . هەروەها بۆ دیالێـکتی کرمانجی ژورۆ لە شێوەی ئاکرێ کۆڵیوەتەوە ، وە بۆ بەشە دیالێـکتەکانی تر تەنها باسی ئەو جیاوازییانەی کردووە کە لەگەڵ بەشـە دیالێـکتی ئاکرێدا هەیانە .

لە بەشی فۆنێتیکدا بۆ دیالێـکتی کرمانجی خوارۆ — (٩) و بۆ کرمانجی ژورۆ — (٨) دەنگی بزوێن (Vowels) ی دیارکردوە و

بە شێوەیەکی زانستی لەو مەسەلەیە کۆڵیوەتەوە[٧٩] . ئەوەی کەم و کورتیش بێت ئەوەیە کە لێك جیاکردنەوەی کورتی و درێژی دەنگە بزوێنەکانی نەسەلماندوە .

بە شێوەیەکی فراوان لە مۆرفۆلۆژی دواوە و بە تایبەتی بایەخی بە کردار داوە (ل ٨٤ — ١٢٩) ، (١٧٧ — ١٩٦) .

بێ شك ئەم نوسراوەی د. ن. ماکەنزی کارێکی گرنگ و گەورەیە ، بەڵام یەکێك لە ناتەواوییەکانی ئەوەیە کە نوسەر ئەو جیاوازییە کەمانەی لە نیوان شێوەی گفتوگۆی شارەکانی بادینانندا هەن دەیانکات بە بەڵگە بۆ دابەش کردنی شێوەی ئەو ناوچەیە بە سەر چەند بەشە دیالێکتێکدا لە ڕاستیدا ئەو جیاوازییانە ئەوەندە نین کە شایانی باس بن ، وە ئاشکرایە کە بۆچی لە کوردناسیدا شێوەی شارەکانی ئاکرێ و ئامێدی و بامەڕنی و زاخۆ .. بە بەشە دیالێکتی بادینان بە ناوبانگن . بە زۆری لەبەر ئەوەیە کە زۆر لێك نزیکن و پێکەوە بەستراون ، نەك دوورن و جیاوازن ، وەك د. ن. مەکەنزی پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە . هەروەها هەندێ باوەڕی هەڵەی بەرامبەر بە زاراوی « زازا » و « کرمانجی » .... دەربڕیوە کە دوورن لە واقعەوە .

پاش تێپەر بونی پێنج ساڵ د. ن. مەکەنزی لە بارەی زمانی کوردییەوە (زاری هەورامی) کتێبێکی نوێی بڵاوکردەوە[٨٠] . لەم

---

(٧٩) هەمان سەرچاوە ، ل ١ ، ٣٠ .

(٨٠) D. N. Mackenize, The Dialect of Awraman, London, 1966.

کتێبەدا ئەوەی کە دوکتۆر مەکەنزی باسی کردبێ ئەمەیە :

فۆنێتیك ـ لێرەدا لە دەنگەکانی شێوەی هەورامـی دواوە و (۲۹) دەنگی کۆنســۆنانت و (۱) ی بزوێنی دیارکردوە ، وە لە جەدوەلی تایبەتیدا شێوە و جۆری دەربڕینیانی نیشان داوە .

مۆرفۆلۆژی ـ لەم بەشەدا بە زۆری باسی پێشگر و پاشگر و جێناوی لـکاو و تصریفی کردار . . . ی کردوە .

ســینتکسیس ـ بە شێوەیەکی ساکار لە ڕســتە و وەرگێڕانی بۆ ئنـگلیزی دواوە .

جگە لەو باسانەی سەرەوە ، نەخشەیەکی هەورامانیشی کێشاوە و زوربەی دێهاتەکانی هەورامانی تۆمار کردوە .

هەرچەندە لەم نوسراوەدا چەند ناتەواوییەك دەبینرێ ، وەك : هەست نەکردن بە چۆنێتی دروست بوّن و شێوەی دەربڕینی هەندێ دەنگی بزوێن ، لە بەشی سینتکسیسدا جۆرەکانی ڕســتەی نیشان نەداوە ... بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کارێـکی سەرکەوتووە .

* * * * * *

# ئەنجـــام

لەبەر ڕۆشنایی ئـــەم باســـە کورتەدا ، کە دەربارەی مێژووی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردییە ، ئاشـــکرا دەبێ و دەردەکەوێ کە زورىەی ئەو کارانەی لە بابەت زمانی کوردییەوە (ڕێزمان و دیالێکت و فەرهەنگ .... ) بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانـــ نوسراون ســەر بە دیالێکتی کرمانجی ژوروَن ، بە تایبەتی کارەکانی : م. گـارزۆنی ، ی. بیریزین ، پ. لێرخ ، ف. میـــوللەر ، ئا. ژابا ، س. ری ، ف. یوستی ، ئا. ســــۆتسین ، س. یەگیزاروٚف پ. بییدار ، .... وە بەشێکی کەمتر سەبارەت بە کرمانجی خواروَن ، وەك : ئا. خۆدسکۆ ، ئو. مان ، ه. شیندلەر ....

کەم و کورتی هەرە گەورەی هەندێ لەو نوسراوانە ، وەك : م. گـارزۆنی ، ی. بیریزین ، ئا. سۆتسین ، ئو. مان ، ف. میوللەر ، پ. بییدار .... لەوەدایە کە بـــە تەواوی باســـی هەمو لقەکانی مۆرفۆلۆژییان نەکردوە ، یاخود جاری وا هەیە سەرانسەر لقی گرنگ پەڕێنراوە ، هەروەها حاڵاتی دەســتوری زمانی کوردی بە ڕاست و ڕەوانی باس نەکراوە .

هەندێ نوســەر ، وەك : ف. یوســتی ، ی ســـۆن ، ل. فۆسسوم ، ی. بیریزین ، ف. میوللەر ، ئـــا. ســـۆتسین . . . لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا ڕێگایەکی چەوتیان گرتووە ، ئەویش

ئەوەیە کە دەستوری زمانە ئێرانیەکانی تریان بەسەر زمانی کوردیدا سەپاندوە .

هەروەها بەم باسەدا دەردەکەوێ کە لەبەر چەند هۆیەکی ئاشکرا ، بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان لە ڕوسیا و ڕۆژئاوادا بە مەسەلەی کوردناسیی بەگشتی و زمانی کوردی بە تایبەتی گرنگی دراوە . بەڵام سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە شێوەیەکی عادیلانە و بە مەبەستێکی پیرۆز کارێکی ئێجگار گەورەی هەبو لە پێشکەوتن و پەرەسەندن و گەشەکردن و سەرکەوتنی کوردناسیدا و توانی بیگەیەنێتە ئەو ڕادەیەی ئەمڕۆ کە لە بارەی زمان و ئەدەب و مێژو و ئەتنۆگرافیا ... ی کوردەوە ژمارەیەکی بێشومار و جوان و پوخت و نایاب کاری زانستی بنوسرێ . بەداخەوە لە ڕۆژئاواشدا پاش شەڕی یەکەمی جیهان هەست بە سستی و بێ بەرهەمی دەکرێت و تا ئەم ساڵانەی دوایی لە بارەی زمانی کوردییەوە شتێکی وەها بڵاونەکراوەتەوە کە شایانی باس بێت ، ئەوەي کە لە ماوەی ئەم ١٥ ساڵەی دوایشدا هاتبێتە کایەوە ، تەنها نوسراوەکانی ( ئەرنست مەکاربۆس و د. ن. ماکەنزی ) ن.

هەرچەندە لە بارەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردییەوە بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان لە کوردستان هیچ شتێکی وەها نەبوە کە شایانی باس بێت ، بەڵام ئەوەی لێرەدا پێویستە سەرنجی بۆ ڕابکێشین ئەوەتە کە لە ماوەی ئەم ٤٠ ـ ٥٠ ساڵەی دواییدا چەند هۆیەکی ئاشکرا کارێکی وەهایان کرد کە کوردستان ( بە تایبەتی کوردستانی

عیراق ) ببێته مەڵبەندی ئەم بزوتنەوە نوێیە لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا .

وەك ئاشکرایە لە زوربەی ئەو لێکۆڵینەوانەی دەربارەی زمانی کوردی نوسراون کەم و کورتی و ناتەواوی زۆرە و هەرچەندە زۆر مەسەلەی زمانەوانی کوردی کەم یاخود هەر باس نەکراون ، بەڵام بنکەیەك پێكهاتووە و دروست بوە و کەرەستەیەکی وەها کۆکراوەتەوە کە لەو رێگایەوە دەتوانرێ گەلێك لێکۆڵینەوەی نوێ و عیلمی بنوسرێ و لەو رێگەیەوە بگەینە گەلێك ئەنجامی بەکەڵك .

* * * *

# ناوەرۆك

